د. عادل شێخانی

# 101 پرسیار لە زانستەکانی قورئانی پیرۆز

101 Questions on the Sciences of the Holy Qur'an









زانستەکانی قورئانی پیرۆز

# ١٠١پرسیار لە زانستەکانی قورئانی پیرۆز

**نووسینی: عادل محمد شێخانی**



یەکەم ١٤٤٤ك - ٢٠٢٣ ز



**نوسینگەی تەفسیر**
بـۆچـاپ و بڵاوکـردنـەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
شێخانی، عادل محمد
١٠١پرسیار لە زانستەکانی قورئانی پیرۆز، عادل محمد شێخانی ، (نووسەر).
٩٦ لاپەڕە،
١٤* ٢١ سم
بابەت، زانستەکانی قورئان
ISBN: 978-9922-690-19-3

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٢٦١٤) ی ساڵی ٢٠٢٢ پێدراوە.

" بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نییە هەمان بیرو بۆچونی نووسینگەی تەفسیر بێ "

زنجیرەی
١

زانستەکانی قورئانی پیرۆز
ئەویندارانی قورئان

# ١٠١ پرسیار لە

# زانستەکانی قورئانی پیرۆز

ئامادەکردنی

د. عادل محمد شێخانی



## بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس‌و ستایشی بێسنوور بۆ پەروەردگاری میهرەبان؛ درودو سڵاوی پەروەردگاریش پێشکەش بە پەیامبەری ئازیزو یاران‌و خێزان‌و هەموو شوێنکەوتووانی بە ئیحسان.

خۆشەویستان‌و ئەویندارانی قورئانی پیرۆز؛ خۆشحاڵین لە نۆبەرەی پڕۆژەیەکی پیرۆزدا ئەم پەرتوکە نایابەتان پێشکەش بکەین کە ئەویش بەشی یەکەمی پڕۆژەی (زانستەکانی قورئانی پیرۆز)ە، کە بریتییە لە (١٠١) پرسیار لە کۆی (٣٠٣) پرسیار کە بە شێوەیەکی پوخت‌وئاسان‌و بە زمانی شیرینی کوردی هەموو زانستەکانی قورئانی پیرۆزی لەخۆ گرتووە .

جێگای شانازییەکی گەورەیە بۆ ئەویندارانی قورئان؛ کە خودای گەورە یارمەتییداین بۆ ئەم پڕۆژە پیرۆزەو بەویستی خودا بەردەوام دەبین لە خزمەتی قورئانی پیرۆزدا؛ تا دوا هەناسەی تەمەن، بۆ ئەوەی هەموو موسڵمانێکی کوردزمان لە تێگەیشتنی قورئانی پیرۆزو زانستەکانی بەهرەمەند بێت.

لە خودای گەورەش داواکارین، لە ئەهلی قورئان‌و خزمەتکاری قورئانمان تۆمار بکات‌و ئەو شەرەفە گەورەیەمان پێ ڕەوا ببینێت.

ئومێدەوارین قورئان ببێتە بەهاری دڵان‌و لابەری خەمان‌و مایەی سەربەرزیی دونیاو ئاخیرەتمان.

سەرکەوتنیش تەنها لە خودای گەورەوەیە.

خزمەتکاری قورئان و سوننەت
عـــادل محــــمد شێخـــانی

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمدلله رب العالمين وصلى الله وسلم على المبعوث رحمة للعالمين، نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

"خۆشەویستان ئەمە پڕۆژەی (١٠١) پرسیارە، وەکو قۆناغی یەکەم لە زانستەکانی قورئاندا، هەموو پرسیارێك وەڵامەکەی ئامادە کراوە، وەکو پڕۆژەیەک ان شاء الله ڕایدەگەینین قۆناغەکانی تریش بەدوایدا دێت هەوڵدەدەین بەویستی خودای گەورە هەموو زانستی قورئان لەچەند سەد پرسیارێکدا کۆ بکەینەوە قۆناغی یەکەمیش بە سەد پرسیار دەست پێدەکەین.



## ١ پێناسەی زانستەکانی قورئان چییە؟ مەبەستمان لە زانستەکانی قورئان چییە ؟

وـ زانستەکانی قورئان ناوە بۆ ئەو زانستەی کە کۆمەڵێك باسی گشتیی‌و گرنگی لەخۆی گرتووە کە پەیوەستە بەقورئانی پیرۆزەوە لە ڕەهەندی جیاوازەوە، یاخود لە کۆمەڵێك بواری جیاواز کە هەر بوارێك لەم بوارانەدا زانستێکی سەربەخۆیەو دەتوانین بڵێین زانستەکانی قورئان ناوە بۆ زانستێك کە کۆمەڵێك بابەتی گشتی لەخۆی گرتووە کە پەیوەستە بە بوارەکانی قورئانی پیرۆزەوە کە دەکرێت هەر بوارێك لەم بوارانەدا زانستێکی سەربەخۆ بێت ..



## ٢ (پێناسەی) قورئانی پیرۆز چییە؟

**و ــ** قورئان وتەی خودای پەروەردگارە کە دابەزیوە بۆ پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) ئەم قورئانە موعجیزەیە بە لەفزەکانی (دەربڕینەکانی) خودای پەروەردگار بەقورئانی پیرۆز هەموو جیهانی بە (مرۆو جنۆکە) ەوە دەستەوسان کردووە کە بتوانن تەنها ئایەتێك لەو قورئانە، یان بەشێکی کەم لەم قورئانە دابنێن، ئەم قورئانە مرۆڤ بە خوێندنەوەی پاداشت وەردەگرێتو لە نوێژا دەخوێندرێتەوەو بۆ ئێمە نەقڵ کراوەو گوێزراوەتەوە بە تەواتوور.

"تەواتوریش» پێناسەی خۆی هەیە ئەویش بریتیە لەوەی کە ڕیوایەتەکانی (گێڕانەوەکان)ی قورئانی پیرۆز کۆمەڵێکی زۆر لە سەحابەو لە تابعین (هاوەڵانو شوێنکەوتوان) تا ئەمڕۆ ڕیوایەتیان کردووە (گێڕاویانەتەوە) کە ژمارەکە ئەوەندە زۆرە کە مەحاڵە ئەو گێڕانەوەیە درۆی تێدابێتو نووسراوەتەوە لە قورئانەکانی بەردەستماندا کە دەستپێدەکات بە سورەتی (الفاتحە) کۆتایی پێ دێت بە سورەتی (الناس) ..



## ٣ جیاوازیی چییە لەنێوان قورئانی پیرۆزو فەرموودەی قودسیدا؟

**یەکەم:** خودای گەورە تەحەددای مرۆڤو جنۆکەی کردووە بەوەی کە دەستەوەسان ئەبن بەرامبەر بەوەی کە بتوانن ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز، یان سورەتێك لە قورئان یان قورئانێکی وا بنووسنەوە، یان دایبنێن

لە کاتێکدا کە لەکاتی دابەزینی قورئانی پیرۆزدا عەرەب لە لوتکەی ڕەوانبێژیی‌و زمانزانیی‌و زمانپاراوییدا بوون، بەڵام ئەو تەحەددایە (ڕکابەرییە) لە (فەرموودەی قودسیدا) نەکراوە، واتا: دەکرێت کەسێک ئەگەر شتێکی وا بکات شتێك بنووسێت لە فەرموودەی قودسییەوە نزیك بێت لە ڕووی وشەوە ئەوە مانای ئەوەنییە کە بتوانێت ئەو ئیعجازە بشکێنێت، نەخێر خودای گەورە تەنها وتوویەتی ئێوە ناتوانن لە ئینس‌و لە جن(مرۆڤ‌و جنۆکە) قورئانێك دابنێن نەك (فەرموودەی قودسی) .

**دووەمیان:** قورئان هەمووی گواستراوەتەوە بۆ ئێمە بە تەواتور واتا: (ڕێگاکانی گێڕانەوەی زۆرن)، بەڵام فەرموودەی قودسیی جاری وا هەیە یەك هاوەڵ، یاخود دوو هاوەڵ گێڕاویانەتەوە، کەواتە: قورئان گێڕدراوەتەوە بە «تەواتور» بەڵام فەرموودەی قودسیی موتەواتر(فرە ڕێگا) نییە، هەروەها ئەوەی کە ئینکاریی (بەڕاستدانان)ی قورئان بکات یان ئینکاری پیتێکی قورئان بکات پێی (کافر) بێباوەڕ دەبێت، چونکە هەمووی جێگیرە ئایەتێکمان نییە صحیح (ڕاست‌و دروست ) بێت یاخود ئایەتێك زەعیف(لاواز) بێت، بەڵام فەرموودەی قودسیی، وەکو فەرموودەی ئاسایی تیایەتی زەعیفە (لاوازە) تیایەتی صحیحە (ڕاست‌و دروستە)و تیایەتی سابت (سەلمێنراو) نییە ئەوەی کە ئینکاری (دژایەتیی‌و بەڕاستنەزانین)ی فەرموودەی قودسیی بکات بە مەرجێك موتەواتر نەبێت پێی کافر نابێت.

**سێیەمیان:** قورئـــــان لەفزو مەعنای (وشـــەو واتای) لە خـــودای پەروەردگارەوەیە واتا: دەقی ئایەتەکەو ماناکەشی خودای گەورە خۆی

ئەو قورئانەی فەرمووە، واتە: بە لەفزی لەلایەن خودای پەروەردگارەوەیەو مانای لەلایەن خودای گەورەوەیە «بەڵام (فەرموودەی قودسی) دەخرێتە پاڵ خودای پەروەردگار کە واتا سەرەکییەکەی لە خودای گەورەوەیەو دەخرێتە پاڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ)وەك ئەوەی کە خەبەری (هەواڵی) پێداوەو پێی ڕاگەیاندوە، ئەو دەقەی لە خودای گەورەوە گێڕاوەتەوە کە « بەسرووش » بۆی هاتبێت، یان ڕاستەوخۆ لە خودای پەروەردگارەوە، لەبەر ئەوە لە فەرموودەی قودسییدا دەوترێت پێغەمبەری خودا ئەفەرمووێت (ﷺ)خودا وای فەرمووە گێڕانەوەکە لەلایەن پێغەمبەری خوداوەیە (ﷺ)و مەرجیش نییە دەقاودەقی وەک قورئان لە خودای گەورەوە بێت، بەڵام واتاکەی‌و داڕشتنەکەی لەلایەن خودای پەروەردگارەوەیە، بەڵام وەك قورئانی پیرۆز بەم شێوەیە خودای گەورە فەرموویەتی ڕاگوێزراوە بۆ پێغەمبەری خۆمان (ﷺ) لە ڕێگای جبریلەوە (علیە السلام) ئەویش بەئێمەی فەرمووە هیچ گۆڕانکارییەکی تێدانییە.

**چوارەمیان:** قورئان حەرامە بەواتا بیگێڕیتەوە، یان بیخوێنیتەوە، مەبەست لە گێڕانەوەی قورئان بەواتا، بریتییە لەو گێڕانەوەیەی کە خۆت بڵێیت خودای گەورە دەفەرمووێت: بۆ نموونە ئایەتێك دەهێنیتەوە بە ماناکەی باسی دەکەیت نەخێر دەبێت قورئان بە دەربڕینی خۆی بخوێنرێتەوە، خودای گەورە دەفەرمووێت: (قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ)، نابێت بڵێیت: خودای گەورە دەفەرمووێت: إن الله واحد، خۆ هەمان واتاو مانا دەبەخشێت، بەڵام لەبەر ئەوەی حەڕامە(قەدەغەو تاوانە) قورئان بەواتا بگێڕدرێتەوە بۆیە دروست نییە بەم شێوازە، بەڵام لە (فەرموودەی قودسی) دا دروستە.

**پێنجەمیان:** قورئانی پیرۆز ڕێنووس‌و نووسین (رسم) ی تایبەت بە خۆی هەیە قورئان ڕێنووسی تایبەتی خۆی هەیە کە پێیدەڵێن ڕەسمی موصحەف بۆ نموونە وشەی»الصلوت « واوەکە ئەلفی مەقصورەی لەسەرە، یان وشەی زەکات، وەکو نووسراوە « الزکوة « قورئان ڕێوڕەسمی خۆی هەیە لە نووسیندا، بەڵام فەرموودەی قودسی وانییە بەشێوەی ئاسایی دەنووسرێت چۆن فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەنووسرێت بەئاسایی ئەمەش بەهەمان شێوە، هەموو ڕستەیەکی قورئانی پیرۆز جیاکراوەتەوە بە نیشانەیەك پێی دەوترێت ئایەت‌و کۆمەڵێك ڕستەش لە قورئاندا پێی دەوترێت سورەت، بەڵام لە (فەرموودەی قودسی) شتی وامان نییە لە حدیثی قودسییدا ناوترێت ئایەت ئایەت‌و سورەتی نییە ..

**شەشەمیان:** مەشروع و سوننەتەو لای هەندێك لەزانایان واجبە لەکاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا بڵێین ( أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) و ( بسم الله الرحمن الرحيم ) بکەین بەهەمان شێوە لەسەرەتای سورەتەکانیشدا، بەڵام لە حدیثی قودسیدا ئەم کارە مەشروع نییەو نە سوننەتەو نە واجبیشە ..

**حەوتەمیان:** قورئـــان موتەعەببەدە بە خـــوێندنەوەی واتە لە نوێـژدا ئەیخوێنینەوە، بەڵام ناتوانین لەبری قورئانی پیرۆز لە نوێژدا فەرموودەی قودسی بخوێنینەوە.

ئەم فەزڵ‌و گەورەییەی کە لە قورئاندا هەیە ئەویش ئەوەیە کە لە هەموو پیتێکی قورئانی پیرۆزدا (دە)چاکەت بۆ دەنووسرێت بۆ هەموو پیتێکی قورئان یەك چاکە بۆ ئەنووسرێت تا (دە)تاکو حەوسەد تەنها

لە قورئانی پیرۆزدا هەیە، بەڵام ئەم خێرە لە فەرموودەی قودسیدانییە، واتا تەنها خوێندنەوەکەی بێ تێگەیشتن پاداشتت نییە تیایدا، بەڵکو ئەو پاداشتە تەنها لە قورئاندا هەیە پیتێکی بە چاکەیەکە چاکەش یەك بەدەیە یان یەك بە حەوسەدە، بەڵام فەرموودەی قودسی ئەو فەزڵەی تێدانییە ئەمە جیاوازییەکانی نێوان قورئانی پیرۆزو فەرموودەی قودسی بوو ..

## ٤ ئەو بابەتانە چین کە ئێمە کە لە زانستەکانی قورئاندا دەیخوێنین ؟

**و-** بابەتەکانی زانستی قورئانی پیرۆز بریتیە لە چۆنێتی دابەزینی قورئانی پیرۆز وەك هۆکاری دابەزینی قورئان، کۆکردنەوەی قورئان، تایبەتمەندییەکانی قورئان، مافی قورئانو خوێندنەوەی، دابەزاندنی قورئان بە چەند زار(لهجة)یەک لە زارەکانی زمانی عەرەبیو هەروەها تەفسیری قورئانو ناساندنی لابەرو لابراوە (ناسخو منسوخ) هەروەها سورەتی مەککیومەدەنی

«السور المكية والمدنية»و هەروەها بابەتی ئایەتە گشتییەکانو ئایەتە تایبەتەکان ( العام والخاص)و ئەمانەش چەند بابەتێکن لەبابەتەکانی زانستی قورئان ..

## ٥ بەرهەمی زانستەکانی قورئـــان چییەو مرۆڤ چی سوودێک لە فێربوونی زانستەکانی قورئان وەردەگرێت ؟

**و- یەکەم:** لە ڕێگای زانستی قورئانەوە ئێمە لە ماناکانی قورئانی پیرۆز تێدەگەینو فێری تەفسیری(واتای) قورئان دەبین.

**دووەم:** دەتوانین دیفاع(پارێزگاریی) لە قورئان بکەین ڕەدی(بەرپەرچی) گومانو شوبهات بدەینەوە.

**سێیەم:** بۆ ئەوەی قورئان بناسین، وەکو خۆی، یان قورئان چۆن دابەزیوە لوغەتی قورئانو ئیعجازی قورئان هەموو ئەم بابەتانە لە زانستی قورئاندا دەخوێندرێت.

**چوارەمیان:** لە ڕێگای زانستی قورئانەوە دەزانین چ هەوڵێك دراوەو چ ماندووبوونێك پێشكەش كراوە لەلایەن زانایانی موسڵمانەوە بۆ خزمەتكردنی قورئان، كە ئەو هەموو تەفسیرەمان هەیە ئێمە پێی ئاشنا دەبین لە ڕوونكردنەوەی قورئانی پیرۆزو ڕوونكردنەوەی ئەحكامی قورئان (یاساكانی قورئان) لە ڕێی زانستی قورئانەوە هەموو ئەمانە فێر دەبین.

**پێنجەمیان:** ئەو گرفتانەی بۆمان دروست دەبێت لە تێگەیشتنی قورئان یاخود لەنێوان دوو ئایەتدا كە وا گومان دەبەین دژایەتییەک بوونی هەیە، یان لەلایەن دووژمنانی قورئانەوە گومان دروست دەكرێت، دەتوانین هەموو ئەم گرفتانە لە ڕێگای فێربوونو شارەزابوون لە زانستەكانی قورئانەوە چارەسەر بكەینو بەرپەرچی هەموو گومانێك بدەینەوەو بزانین هەرگیز لەنێوان هیچ ئایەتەكانی قورئاندا پێچەوانەو دژیەكییەک بوونی نییە، بەڵكو ئەوە ئێمە پێشتر لە ماناكەی نەگەیشتین بۆیە دەڵێین وامان گومان دەبرد، لێرەوە بۆمان دەردەكەوێت كە هیچ پێچەوانەیەک لەنێوان ئایەتێكو ئایەتێكی دی دا نییە ...



## ٦ ئایا زانستەكانی قورئان ناوی دیكەی هەیە ؟

وــ بەڵێ هەندێك جار پێی دەگوترێت زانستەكانی تەفسیر یان ئەوترێت ئوسوڵی تەفسیر هەر چەندە ئەم سێ زانستە (زانستی قورئان، زانستی تەفسیر، ئوسوڵی تەفسیر، مەنهەجی موفەسسیرین) ئەم چەند زانستە پەیوەندییان زۆر بەیەكەوە چڕە، كۆمەڵێك زانستی تێكهەڵكێشن بەیەكەوە بۆیە زۆرجار ئەم زانستانە ئەچێتە ژێر سایەی زانستەكانی قورئانی پیرۆزەوە ..



## ٧ ئەم زانســتانە لەچیەوە سەرچــاوەیان وەرگرتووەو لــە كوێوە وەرگیراون؟

وــ ئەم زانستانە وەرگیراون لە قورئانی پیرۆز خۆیەوەو پاشان لە سوننەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) خۆیەوە، پاشان لە وتەو لە ئاثاری سەحابەو تابعینەوە.



## ٨ حوكمی فێربوونی ئەم زانستانە چییە ئایا فەڕزی عەینە یان فەڕزی كیفایەتە ؟

وــ بێگومان فەڕزی كیفایەتە فەڕزی عەین نییە ، زانستخوازان (طلبة العلم) هەڵدەستن بە فێربوونی ئەم زانستە بۆ ئەوەی بڵاوی بكەنەوە، تا كەسانێك هەبن شارەزای زانستی قورئان بن بۆ ئەوەی خزمەتی قورئانی پیرۆزی پێ بكەن ..


٩

## جیاوازی نێوان وشەی مصحف (موسحەف) لەگەڵ قورئـــاندا چـــییە ؟

و- مصحف بریتیە لەو پەڕاوەی کە قورئانی پیرۆزی تیادا نووسراوەتەوە، وەکو وتمان دەستپێدەکات بە سورەتی (الفاتحة) کۆتایی پێ دێت بە سورەتی (الناس)، بەڵام «قورئان» بریتیە لە ناوێك بۆ کەلامی خودای پەروەردگار(وتەی خودای باڵادەست) بێگومان وتەی خودایە ئەوەی کە نووسراوەتەوە لە مصحف یان نەنوسراوەتەوە یان کە کەسێك لەبەریش بیڵێ پێی دەڵێن قورئان کەواتە مصحف بریتیە لە کتێبەکە ئەو پەڕاوەی کە تیایدا نووسراوەتەوە و»قورئانیش بریتیە لەو (وتەو) کەلامەی کە تیایدا نووسراوەتەوە کەلامەکە پێی ئەوترێت قورئانو پەڕەکانی کتێبەکەش پێی ئەوترێت «مصحف“ ..


١٠

## زانستەکانی قورئـــان چـۆن دروســـتبوون و بەچەند قۆنــاغدا تێپەڕیون ئەم زانستانە چۆن گەیشتۆتە دەستی ئێمە ؟

و- سەرەتاو قۆناغی یەکەمی زانستەکانی قورئانی پیرۆز بریتی بووە لە وەرگرتنی ڕوو بە ڕوو لە زارەوە بۆ زار، یاخود بڵێین بەسەر زارەکی (شفوی) وەرگیراوە (هاوەڵان) لە نێوان خۆیاندا باسیان کردووە لەسەرەتای سەردەمی هاوەڵانەوە چەند هاوەڵێك بەناوبانگبوون بەوەی کە لە تەفسیری قورئاندا ناوداربوون لەوانە « عبدالله بن عباس »، «عبدالله بن مسعود» ..هتد ئەمانە شارەزابوونو باسیان کردووە تەفسیری قورئانیان بۆ خەڵك ڕوون کردۆتەوەو ئەوانیش قوتابییان

هەبووە وەکو «مجاهد، عكرمة، سعيد بن جبير، عطاء بن أبي رباح ......» هەموو ئەمانە تابیعینن لە زانستی قورئانی پیرۆزدا شارەزاییان هەبووە و قوتابی «ابن عباس» بوون لە تەفسیردا .

قۆناغی دووەمیش دەست کراوە بە نووسینەوە ، ئێمە لە کتێبەکانی حدیثدا کتاب التفسیر هەیە وەک: (کتاب التفسیر ) لە» صحيحی بخاری» (کتاب التفسیر) مان هەیە لە «صحيحی مسلم» لە سونەنەکانیش...... هەروا دواتر دەست کراوە بە تەفسیر، وەکو تەفسیری « الطبري « ابن كثير.......))

«قۆناغی سێیەم: بریتی بووە لەوەی کە تەفسیر بەشێوەیەکی سەربەخۆ نووسراوەتەوە یان زانستی قورئان سەربەخۆ نووسراوەتەوە جاری وا هەبووە تایبەتبووە بە زانستی قورئان جاری وا هەبووە چەند جۆرێك لە زانستی قورئان لە کتێبێکدا ،»

قۆناغی چوارەم کە ئێستایە لە ئێستاشدا کتێب زۆر زۆر بووە بە سەدەها کتێبمان هەیە لە زانستەکانی قورئان لە نێوان کتێبی بچووكو کتێبی فراوانترو جاری وا هەیە چەند مەسائیلێکی تایبەت لە کتێبێکدا باسکراوەو لە ئێستادا زۆر بەقوڵتر لە زانستەکانی قورئاندا کتێبو نووسینمان هەیە.



## ١١ ناودارترین ئەو كتێبانە چین كە لە زانستی قورئاندا زۆر ناودارن ؟

وــ كۆمەڵێك كتێبمان هەیە كە دەتوانین بڵێین مەوسوعاتن لە زانستەكانی قورئانی پیرۆزدا یەكێك لەوانە كتێبی « البرهان فی علوم القران » للإمام بدرالدين الزركشي « كە لەم كتێبەدا باسی چلوحەوت جۆری كردووە لە واتای زانستەكانی قورئان، دووەم كتێبی « الإتقان للإمام جلال الدين السيوطى» كە لەم كتێبەدا هەشتا جۆری لە زانستەكانی قورئان باسی كردووەو یەكێكە لە فراوانترین كتێبەكانی زانستەكانی قورئان، ئیمامی الزركشي هاتووە چلوحەوت بابەتی باسكردووە لە زانستی قورئاندا ئەم هاتووە كردوویەتی بەهەشتا بابەت، دوای ئەویش كتێبی «مناهل العرفان للشيخ محمد عبدالعظيم الزرقانی » ئەم سێ كتێبە لە كتێبە بەناوبانگەكانن لە زانستەكانی قورئانی پیرۆزدا، دوای ئەویش كتێبی ترمان زۆرن، بەڵام ئەم سێ كتێبە لە هەموویان بەناوبانگترن وەك كتێبی (مباحث في علوم القرآن للشيخ صبحي الصالح)و (مباحث في علوم القرآن للشيخ مناع القطان)، دوای ئەوەش ئەمڕۆ ناوەندێكی تایبەت هەیە بە زانستی قورئانو تەفسیر كە ناوەندی تەفسیرە (مركز التفسير) دەیەها كتێبیان لەم بابەتە هەیە بابەتەكانی زانستی قورئانیان چاپكردووە ..



## ١٢ سرووش مانای چییە لە زمانو زاراوەدا ؟

وــ لەزمانی عەرەبیدا وشەی «سرووش» بە مانای ڕاگەیاندن دێت بەنهێنییو بەخێراییی، بەڵام لە شەرعدا وەكو زاراوەیەكی شەرعیی لە

زانستی قورئاندا «بریتییە لە ڕاگەیاندنی خودای پەروەردگار بۆ یەکێك لە پێغەمبەرەکانی(علیه السلام) بە حوکمێکی شەرعیی بەشێوەی نهێنیی‌و خێرا، وەکو چۆن خودای پەروەردگار لە ڕێگای «جیبریلەوە (علیه السلام) سرووشی خۆی ناردووە بە ئەحکامە شەرعییەکان بۆ پێغەمبەری خۆمان محمد(ﷺ) بەشێوەیەکی خێراو نهێنیی ..


١٣

## جۆرەکانی سرووش لە ڕووی زمانەوانییەوە چین ؟

**و-** پێنج جۆر سرووشمان هەیە کە لە ڕووی زمانەوانییەوە پێی دەگوترێت سرووش:

**یەکەمیان:** ئیلهامی خودایی کە ئیلهام (پەیام، نیگا) یەکی خوداڕسک (فطری)ە بۆ مرۆڤەکان کە خودای گەورە ئیلهام دەبەخشێت بەهەندێك لە مرۆڤەکان هەروەك چۆن ئیلهامی نارد بۆ دایکی پێغەمبەر موسا(علیه السلام ) (وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِيهِۖ فَإِذَا خِفۡتِ عَلَيۡهِ فَأَلۡقِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحۡزَنِيٓۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيۡكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ )القصص/٧

**دووەمیان:** ئیلهامی غەریزیی(نیهاد، نەژاد)یی بۆ ئاژەڵەکان خودای گەورە فێریان ئەکات بە(ئیلهام‌و نیگا)ی خۆی کە بتوانن کاروباری خۆیان بەڕێوەبەرن، وەك: چۆن سرووشی ناردووە بۆ هەنگ ، خودای گەورە دەفەرمووێت (وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ) النحل (٦٨)

**سێیەمیان:** فەرمانی خودایی بۆ دروستکراوە بێگیانەکان جگە لە مرۆڤ‌و ئاژەڵ، وەکو سرووشی خودای باڵادەست بۆ ئاسمان کە دەفەرمووێت

(فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ) فصلت (١٢).

**چوارەمیان:** ئاماژەی خێرا بە یەکێك لە ئەندامەکان، وەکو چۆن فەرمانی بە پێغەمبەر زەکەریا (علیە السلام) کرد کە سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت لەگەڵ گەلەکەی قسە نەکات بە ئیشارەت(هێماو ئاماژە) پێی وتن کە ئەم قسە ناکاتو بە ئاماژە داوای لێکردن کە تەسبیحی(یادو زیکری) خودای گەورە بکەن بەیانییو ئێوارە، تاوەکو ئەو سێ ڕۆژە تەواو دەبێت، خودای گەورە دەفەرمووێت (فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا) مریم (١١)

**پێنجەمیان:** وەسوەسەو ختوورەی شەیتان کە بۆ پێڕی خۆیو هەوادارانی خۆی دروستی دەکات، بەڵام ئەوە وەحییە لە شەیتانەوە، خودای گەورە دەفەرمووێت (وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٞۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ) الأنعام (١٢١)




## سرووش لەزاراوەی شەرعییدا چەند جۆری هەیە ؟

**و-** سرووشی شەرعیی (چوار) جۆری هەیە هەموو جۆرەکانیشی تەنها بۆ پێغەمبەرانە،

**یەکەمیان:** خەوبینینی ڕاستو دروستە؛ چونکە خەوی پێغەمبەران سرووشەو لە خوداوەیە بەهیچ شێوەیەك شەیتان ناتوانێت لە خەودا بچێتە خەیاڵو خەوی پێغەمبەران، بۆیە ئەو خەوەی کە پێغەمبەران

دەیبینن حەق‌و ڕاستییە، وەك چۆن لە (صحیح البخاری)دا هاتووە، کە دایکە عائیشە(سەلامی خودای لێبێت ) دەفەرموێت: سەرەتای دەست پێکردنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر چی بووە ئەویش خەونی ڕاست‌و دروستبووە پێغەمبەری خودا (ﷺ)هەر خەوێکی بینیبوایە، وەکو بەرەبەیان ئەهاتە دی و دەفەرموێت:( أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ ).

**دووەمیان:** ئاخاوتنی خودای پەروەردگارە لەگەڵ پێغەمبەران بەبێ نێوەند، بەڵام لەودیوی پەردەوە.

**سێیەمیان:** ئەو (نیگا- پەیام)ئیلهامانەی کە خودای گەورە دەیبەخشێت بە پێغەمبەران، یاخود دەیخاتە دڵی پێغەمبەرانەوە کە ئەو شتە بڵێن» ئیلهامی پێغەمبەرانە بۆ دڵی پێغەمبەران (علیه السلام)

**چوارەمیان:** سرووشی ئاشکرا کە لە ڕێگای پەیامنێری خودای گەورەوە کە جبریلە (علیه السلام) بۆ پێغەمبەران، بەڵگەشمان لەسەر ئەم جۆرەیان ئەوەیە کە خودای گەورە دەفەرموێت( وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٌ) الشوری (٥١)

## ١٥ حاڵەتەکانی هاتنە خوارەوەی سرووش بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) چۆن بووە چەند حاڵەتی هەبووە ؟

**وـ** هاتنی جیبریل (علیە السلام) بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەسرووش دوو شێوەی هەبووە.

**یەکەمیان:** پێغەمبەری خودا (ﷺ) گوێی لەدەنگی جبریل بووە (علیە السلام) وەکو دەنگی زڕەی زنگوڵەیەك، یان وەکو زنجیرێك کە چۆن بەرئەدرێتەوە بەسەر بەردێکدا بەم شێوەیە بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) هاتووە خودای گەورە ئەوەی کە ویستوویەتی بە ئیلهام ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر( ﷺ) دوای ڕۆیشتنی جیبریل (علیە السلام) و لاچوونی ئەم دەنگە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیتر ئەو سرووشەی کە بۆی هاتووە لەبەری کردووەو تێگەیشتووەو گەیاندوویەتی بە هاوەڵان.

**دووەمیان:** جیبریل (علیە السلام) هاتووە لەسەر شێوەی مرۆڤێکدا زۆرجار هاتووە لەسەر شێوەی» دوحیەی کلبی، یان لە شێوەی ئەعرابیەك.

پاشان هاوەڵان نەیانزانیوە ئەوەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خودایە (ﷺ) جبریلە، وەکو چۆن لە ڕووداوی (حدیثی جیبریلا) زووتر وایانزانیوە ئەمە ئەعرابیەکە (عارەبێکی دەشتەکییە) یاخود «دیحیەی کەلبییە»چونکە زۆرجار جیبریل(علیە السلام) لەسەر شێوەی ئەو هاتووە بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ)، بەڵگەشمان بۆ ئەم دوو شێوازە ..

ئەو فەرموودەیەیە کە (ئیمامی بوخاری) گێڕاویەتییەوە لە سەحیحەکەیدا کە لە گێڕانەوەی دایکە عائیشەیە( سەلامی خودای لێ بێت) کە دەفەرموێت ( عن عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحْيَانًا يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ- وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ- فَيُفْصَمُ عَنِّي وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ، وَأَحْيَانًا يَتَمَثَّلُ لِيَ الْمَلَكُ رَجُلاً فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ)



**١٦ ئەو ئایەتانە چین کە سەبارەت بەوەی کە قورئانی پیرۆز هەمووی بەجارێك دابەزیبێت بۆ ئاسمانی یەکەم دواتریش بۆلای پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟**

و- بەڵگەمان ئەم چەند ئایەتانەن کە خودای گەورە دەفەرمووێت: (إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ)الدخان (٣) هەروەها دەفەرمووێت (إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ) القدر (١) هەروەها دەفەرمووێت(شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِۚ)البقرة (١٨٥)



**١٧ ئەو ئایەتانە چین کە باس لە دابەزینی قورئـــانی پیرۆز دەکەن بەشێوەی پارچە پارچە، یاخود بەش بەش بەپێی ڕووداوەکان ؟**

و- خودای گەورە دەفەرمووێت (وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا)الإسراء(١٠٦)، هەروەها دەفەرمووێت (وَقَالَ

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا﴾ الفرقان (٣٢)



## ١٨ بیروڕای زانایانی ئیسلام چییە سەبارەت بە دابەزینی قورئان ؟

و- دەتوانین بڵێین زانایان چەند ڕاو بۆ چوونێکیان هەیە:

بۆچوونی یەکەم: پێیان وایە کە قورئان دوو جۆرە دابەزینی هەیە.

دابەزینی یەکەم: لە( اللوح المحفوظ)ەوە کە لە ئاسمانی حەوتەمە بۆ (بیت العزة) کە لە ئاسمانی دوونیایە.

دابەزینی دووەم: پێیان وایە دابەزینی قورئان لە ڕێی جیبریلەوە (علیه السلام)بە بەش بەش کراوی بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ماوەی بیستوسێ ساڵدا ئەمەش ڕای «ابن عباس»و زۆربەی زۆری زانایانە.

بۆچوونی دووەم: پێیان وایە قورئان هەمووی بەجارێك دابەزیوە لە شەوێکی پیرۆزو موبارەکدا کەشەوی قەدرە بۆ ئاسمانی یەکەم، پاشان هێواش هێواش بەپێی ڕووداوەکان بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمەش ڕای ئیمامی «شەعبی و ئیبن سحاق‌و کۆمەڵێکە لە زانایان.

بۆچوونی سێیەم: پێیان وایە کە قورئان بە هەردوو شێوەکەی کە دابەزیوە بە بەش بەش دابەزیوە جاری یەکەم لە ئاسمانی حەوتەمەوە بۆ (البیت العزة) لە ئاسمانی یەکەمەوە لە بیستوسێ شەوی قەدرا هەر شەوێك لەو بیستوسێ شەوەی مانگی ڕەمەزان بەشی ساڵێك دابەزیوە، دابەزینی دووەمیش دابەزینە لە ئاسمانی یەکەمەوە، پاشان بۆ

پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ماوەی ئەو بیستوسێ ساڵەدا، ئەمەش ڕای موقاتیلو ئیبنوجورەیجە.




## حیكمەت چییە لەوەی کە قورئانی پیرۆز دابەزیوە بەیەك پارچە لە (لوح محفوظ) وە بۆ (البیت العزة ) بۆ ئاسمانی یەکەم ؟

**و- یەکەمیان:** لەبەر گەورەیی‌و پلەوپایەی قورئانی پیرۆزو گەورەیی دابەزینی قورئان.

**دووەمیان:** گەورەیی شان‌و شکۆو پلەوپایەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) و ڕێزگرتن لە لایەن خودای گەورەوە بەو فزڵەی کە قورئانی بۆ دابەزاندووە بەیەکجار بۆ ئاسمانی یەکەم.

**سێیەمیان:** ڕێزگرتن و خەڵاتکردنی ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەوەی فریشتەکان لە ئاسمانەوە بزانن کە ئەم ئوممەتە چەندێك گەورەیەو چەندێك خودای پەروەردەگار ڕێزداری کردوون بە دابەزینی قورئان.

**چوارەمیان:** ڕاگەیاندنی بە هەموو دانیشتوانی ئاسمانەکان لە فریشتەکان بۆ ئەوەی بزانن کە ئەم کتێبە دابەزیوە بۆ کۆتا پێغەمبەر کە موحەممەدە (ﷺ)و ئەمەش کۆتا کتێبە دابەزێت لەلایەن خودای پەروەردگارە بۆ سەر زەوی.

**پێنجەمیان:** خودای گەورە دەیەوێت بەئێمە ڕابگەینێت کە دەزانێت چی لەوەوپێش ڕوویداوە چی لە داهاتوودا ڕوودەدات؛ چونکە لە قورئانی پیرۆزدا ئەم شتانە باسکراوەو ئاماژەی پێ دراوە کە پێشتر ڕوویداوەو

ئەو شتانەشی کە هێشتا ڕووینەداوە کە خودای گەورە باسی کردووە دوایش لەکاتی ڕوودانەکەدا ئایەتەکانی دابەزاندووە بۆ پێغەمبەر (ﷺ).



## ٢٠ ئەو بڕە چەند بووە کە دابەزیوە بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) ؟

**و-** بڕەکان جیاوازبوون بۆ نموونە هەندێك کات بڕێکی دیاریکراوبوو جاریواش هەبووە چەند بەشێك لە ئایەتێك دابەزیوە جاریواش هەبووە ئایەتێکی تەواوو کامڵ دابەزیوە، هەندێک جاریش (پێنج) ئایەت (دە) ئایەت دابەزیوە کە ئەمەشیان زۆربەی کاتەکان بووە، یاخود جاری وا هەبووە سورەتێکی دوورو درێژ بەتەواوی دابەزیوە وەکوو سورەتی (الأنعام) لەگەڵ دابەزینیدا حەفتا هەزار فریشتە دابەزیون بۆ بەڕێکردن لەگەڵ جبریلدا (علیه السلام) هێناویانە بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) یان جاری وا هەبووە سورەتێکی بچووك دابەزیوە، وەکو سورەتی ( الفلق, الناس )



## ٢١ ئەو کاتانەی کە دیاریکرابوو بۆ دابەزینی قورئانی پیرۆز، قورئان بەچەندێك دابەزیوە؟

**و-** کاتی دابەزینی قورئانی پیرۆز بیستوسێ ساڵی پێچووە (سیانزدە) ساڵ لە «مککە» (دە) ساڵیش لە «مەدینە»، لەکاتی هاتنی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) تاوەکو وەفاتی..



## ٢٢ حیكمەت چییە لەوەی كە قورئانی پیرۆز بەش بەش دابەزیوە ؟

**وـ یەكەمیان:** بۆ دڵنیاكردنی دڵی پێغەمبەری خودا (ﷺ) كە هەموو كات لەگەڵ دابەزینی ئایەتێكی نوێدا، یاخود سورەتێكی نوێدا پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئازارو ناڕەحەتیەكانی لەسەر كەم دەبوویەوە.

**دووەمیان:** بۆ ئاسانكردنی لەبەركردنو تێگەیشتنی.

**سێیەمیان:** دابەزینی لەكاتی ڕووداوەكاندا ؛ چونكە لەگەڵیدا حوكمێك دادەبەزێت.

**چوارەمیان:** لەبەر پلەبەندیی، یاخود تەدەڕڕوجو ڕوونكردنەوەی ئەحكامە شەرعییەكان بۆ ئەوەی كە هەنگاو بەهەنگاو بێت نەك هەمووی بەیەكجار بێت.

**پێنجەمیان:** لەبەر بەردەوامبوونی تەحدداكردنو دەستەوەسانكردنی خودای گەورە بۆ عەرەب كە بیستوسێ ساڵیدا پێیان گەر بیانتوانیایە بیكەن، بەڵام لەماوەی ئەو بیستوسێ ساڵەدا نەیانتوانی ئەم كارە بكەن ئەم تەحددایە بشكێنن ئایەتێك بێننو دروستی بكەن.

**شەشەمیان:** بۆ ئەوەی كە بەردەوام لەگەڵ دابەزینیدا ئەم قورئانە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی كە لەلایەن خودای پەروەردگارەوەیە( ﷻ ).



## ٢٣ یەکەمین ئایەت کە دابەزی بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) چ ئایەتێك بووە، یاخود چ سورەتێك بوو؟

و_ چەند ڕایەك هەیە سەبارەت بەوەی کە یەکەمین سورەتو ئایەت کە دابەزیوە بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) چی بووە:

**بۆچوونی یەکەمیان:** ئەوەیە کە یەکەمین کۆمەڵە ئایەت کە دابەزی بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەرەتای سورەتی (العلق) بووە(بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ، ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ٥) ئەم پێنج ئایەتەی سەرەتای سورەتی (العلق) یەکەمین کۆمەڵە ئایەت بووە کە دابەزی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگەش بۆ ئەمە فەرموودەی دایکە عائیشەیە (خودا لێی ڕازی بێت ) کە لە (سەحیحی بوخارییو موسلیم)دا هاتووە کە فەرموویەتی سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە مانگی ڕەمەزاندا دەچوو بۆ ئەشکەوتی «حراء» لەوێدا دەمایەوە ( حَتَّى جَاءَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ)، تا ئەو کاتەی کە سرووشی بۆ هات لە ئەشکەوتی (حراء) پێشووتر خەونی دەبینی هەر خەونێکی ببینیایە خەونەکە دەهاتە دی سەرەتای سرووشیش خەونبینینبوو دوایی ئەوەش کە سرووش لەلایەن جبریلەوە (علیەی السلام) دابەزی بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە پێی فەرموو بخوێنە «إقرأ » بۆ جاری سێیەم جبریل( علیه السلام) پێغەمبەری (ﷺ) بەخۆیەوە گوشییو پێی فەرموو بخوێنەوە ( ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ٥)

**دووەمیان:** ڕاو بۆ چوونیان وایە کە سورەتی (المدثر) یەکەمین سورەتە کە دابەزیوە بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەهەمان شێوە بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە کە لە سەحیحدا هاتووە کاتێك «ابی سەلەمەی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عوف» پرسیار دەکات لە» جابری کوڕی عبدالله « (یەکەم سورەتی قورئان) چی بوو کە دابەزی، یاخود کامە قورئان لە پێشتردا دابەزیوە، ئەمیش فەرمووی (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ)، دەفەرموویێت پێم وت: ئەی (ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ) فەرمووی من لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بۆتان دەگێڕمەوە ئەوەتان بۆ باس دەکەم کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی مانگێك من لە ئەشکەوتی (حراء) مامەوە تا ئەو کاتەی ئەو مانگە تەواو بوو لەوێ مامەوە، دواتر هاتمە خوارەوە، لەنێو دۆڵەکەدا بانگیان کردم، بەڵام تەماشام کرد؛ لەپێش و دوای خۆمەوە کەسم نەبینی، سەیری لای ڕاستو چەپی خۆم دەکرد کەسم نەبینی، پاشان دووبارە بانگیان کردمەوە سەرم بەرزکردەوە تەماشام کرد، کەسم نەبینی، پاشان بۆ جارێکی تر بانگیان کردم، سەرم بەرزکردەوە بینیم جبریل (علیە السلام) لەسەر عەرشە لە ئاسماندا بۆیە تووشی لەرزینێك بووم، دواتر هاتم بۆلای»خەدیجە» پێم وت (دثرونی.... دثرونی)داپۆشن..... داپۆشن، دواتر ئاویان کرد بەسەرما خودای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ)، بەڵام ئەمە زۆر سەریح (ڕاشکاو) نییە واتا ڕاستەوخۆ ئەوە ناگەینێت کە یەکەمجار بوویێت، بەڵکو مەبەستی لەو کاتەیە کە گەڕاوەتەوە لە ئەشکەوتەکە، بەڵام فەرموودەی یەکەمان لەناو ئەشکەوتەکەدا بووەو بۆ یەکەمجار جبریل (علیە السلام) هاتووە بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ).

**سێیەمیان:** ڕاو بۆچوونیان وایە کە سورەتی ( الفاتحة ) یەکەمجار دابەزیوە، بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە ئەم فەرموودەیە کە»ئیمامی ئاجوری لە کتێبی( الشریعة) باسیکردووە و»ئیمامی بیهەقی لە (دلائل النبوة) باسیکردووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی بە»وەرەقەی کوڕی نەوفل» کاتێك کە بەتەنیا ئەبم دەنگێ پێم دەڵێیت یامحمد یامحمد کاتێك گوێم لەو دەنگە دەبێت منیش ڕادەکەمو دوور دەکەومەوە (وەرەقەی کوڕی نوفل) فەرمووی: بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمجارە ئەگەر شتێکی ئاوا بوو ڕامەکە لە شوێنی خۆت بوەستە تا بزانین چیت پێ دەڵێت ئینجا دواتر وەرەوە بۆ لای من بزانم چیت پێ دەڵێت، ئەمجارەیان کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەتەنیا بوو بانگی لێکرا پێیان وت ئەی محمد (ﷺ) بڵێ ( ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ(٢) ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ(٣) مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ (٤) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ(٦) صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ (٧).

بەڵام ئەمەشیان هەر بەڵگەیەکی سەریح(ڕوونو دیارو ئاشکرا)نییە لەسەر ئەوەی کە یەکەمجار بووبێت.

**چوارەمیان:** ڕاو بۆچوونیان وایە کە (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ) یەکەم ئایەتە کە دابەزیوەو سورەتی (إقرأ) یەکەم سورەتە، ئەمەش «ئیمامی واحیدی لای وایەو دەیگێڕێتەوە لە» عیکریمەو حەسەنی بەسرییە وە « فەرموویانە یەکەم شت کە دابەزیوە لە قورئاندا (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)ە کە دابەزیوە لە مەککەداو یەکەم سورەتیش سورەتی (ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ)، بەڵام ئەوەی جێگای (هاوڕایی زانایان) بێت کە (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ) تەنها ئایەتێکە لە سورەتی ( النمل )و یاخود ئایەتێك نیە لە سورەتی

(التوبــة ) بەڵام كۆدەنگی لەسەر ئەوەنییە (بِسۡــمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيــمِ ) ئایەتێك بێت لە هەموو سورەتەكانی قورئاندا جگە لە سورەتی (النمل)، بۆیە دەبینین ڕای یەكەم لەهەموو(ڕاكان) بەهێزترە ..



## دوا ئایەت و كۆتا ئایەت چی بوو كە دابەزیوە لە قورئانی پیرۆزدا بەشێوەیەكی گشتیی ؟

و_ لەمەشدا جیاوازی هەیە كە دوا ئایەت چی بووە كە دابەزیوە لە قورئانی پیرۆزدا هەندێك لایان وایە ئایەتی «ریبا» لە دواترین ئەو ئایەتانەیە كە لە قورئاندا دابەزیوە، كە خودای گەورە دەفەرموویێت ( يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا ٱتَّقُوا ٱللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ) البقرة(٢٧٨ )، ئەمەش ڕاو بۆچوونی»ئیمامی عومەرو ئیبن عەباسە «ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێت، بەڵام هەندێكی تر دەڵێن دوا ئایەت كە دابەزیوە ئەم ئایەتەیە ( وَٱتَّقُوا يَوۡمًا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٍ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ) البقره (٢٨١)، ئەمەش ڕاو بۆچوونی» ئیبن عەباس‌و سەعیدی كوڕی جوبەیرە ..ڕاو بۆچوونێكی تریش هەیە پێیان وایە كۆتا ئایەت كە دابەزیوە بریتیە لە ئایەتی «قـەرز»( يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـًٔاۚ فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَٱسۡتَشۡهِدُوا شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٌ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ وَلَا

یَأْبَ لشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُوا وَلَا تَسْـَٔمُوٓا أَن تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِ ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ للَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓا إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا وَأَشْهِدُوٓا إِذَا تَبَايَعْتُمْ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ وَإِن تَفْعَلُوا فَإِنَّهُ فُسُوقٌ بِكُمْ وَتَّقُوا للَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ للَّهُ وَللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ) البقرة(٢٨٢)، ئەمەش ڕای «زوهری و سەعیدی کوڕی موسەییەب»ە ، ئەگەر سەیری ئەم سێ ڕاو بۆچوونە بکەین دەبینین هەرسێ ئایەتەکە لەیەکترییەوە نزیکن بەتایبەتی ئایەتی دووەمو سێیەم کە ئایەتی (٢٨١) _(٢٨٢) ئەمانە کۆتا ئایەتن لە سورەتی ا(لبقرة)دا کە دابەزیوە لە قورئانی پیرۆزدا.



## ٢٥ دوا سورەت چی بووە کە بە کاملّی(تەواویی) دابەزیوە لە قورئانی پیرۆزدا ؟

و- سورەتی النصر (إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ )، کۆتا سورەتە کە هەمووی بەیەکجاری دابەزیوە لە قورئاندا ..



## ٢٦ یەکەم ئایەت چییە کە دابەزیوە سەبارەت بە حوکمی شەڕاب و مەی ؟

و- یەکەم ئایەت کە دابەزی بریتی بوو لە ئایەتی ( وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلْأَعْنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ) النحل (٦٧) ئەمە یەکەمین ئایەتە کە باسی شەڕاب ئەکات بێ ئەوەی ئاماژە بکات بە حەڕام کردنی، یان بەحەڵاڵ کردنی، هەرچەندە لای هەندێك لە زانایان لایان وایە کە خەمر(مەی) سەرەتا بە ئیباحەی

شەرعی، خودای گەورە، وەکو مەدحێك (ستایشێك) فەرموویەتی دارخورما و ترێ ئێوە هەم وەکو ڕزقێك (ڕۆزییەك) بەکاری دەهێنن هەم دەیکەن بە سوکر شەراب (بێهۆشکەر- مەی).

کۆتا ئایەت کە دابەزی سەبارەت بە شەڕاب‌ومەی ئەم ئایەتە بوو کە خودای گەورە دەفەرمووێت (يَٰٓأَيُّهَا لَّذِينَ ءَامَنُوٓا إِنَّمَا لْخَمْرُ وَلْمَيْسِرُ وَلْأَنصَابُ وَلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ لشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ) المائدة (٩٠)، لەم ئایەتەدا خودای گەورە مەی حەڕام کردو دەفەرمووێت (رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ )، واتا ئەوانە پیسن‌و لە کردەوەی شەیتانن دوورکەونە لێی تا ڕزگاربن .



## ٢٧ یەکەمین ئایەت‌و کۆتا ئایەت چی بووە سەبارەت بە ریبا (سوو) ؟

و- یەکەمین ئایەت کە دابەزی سەبارەت بە سوو ئەم ئایەتە بوو خودای گەورە دەفەرمووێت ( وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَا فِىٓ أَمْوَٰلِ لنَّاسِ فَلَا يَرْبُوا عِندَ للَّهِ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ للَّهِ فَأُولَٰٓئِكَ هُمُ لْمُضْعِفُونَ ) الروم (٣٩)،

کۆتا ئایەتیش بریتی بوو لەم ئایەتە ( يَٰٓأَيُّهَا لَّذِينَ ءَامَنُوا تَّقُوا للَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِىَ مِنَ لرِّبَوٰٓا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ) (٢٧٨) ( فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِّنَ للَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ) (٢٧٩)البقرة ..



### ٢٨ یەکەم ئایەت چی بووە کە دابەزیوە خودای گەورە مۆڵەتی داوە بە بڕواداران کە جیهاد بکەن لەپێناو خودای گەورەدا ؟

وـ یەکەم ئایەت کە دابەزی سەبارەت بە جیهاد بریتی بوو لەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرمووێت ( أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ) الحج (٣٩) لێرەدا خودای گەورە ئیزنی(ڕێگای) داوە بە بڕوادارن کە جیهاد بکەن کوشتاری بێباوڕان بکەن ..



### ٢٩ سوودو زانستی زانینی ئەوەل و ئاخیری(سەرەتاو کۆتایی) ئەم ئایەتانە چین کاتێك دەڵێین ئەمە سەرەتا ئایەتە دابەزیوە ئەمە کۆتا ئایەتە دابەزیوە ئایا چیمان دەست دەکەوێت ؟

**وـ یەکەم:** کۆمەڵێك سوودمان دەست دەکەوێت لە زانینی ئەوەلیەت و ئاخیرییەت سەرەتاو کۆتایی کە دابەزیون، یاخود کامەیان لەپێش کامەیان دابەزیوە «یەکێك لە سوودەکانی ئەوەیە کە فێری زانستی «ناسوخ و منسوخ «دەبین دەتوانین ناسوخ و منسوخ لەیەکتری جیا بکەینەوە «ناسخ ئەو ئایەتەیە کە نەسخ دەکاتەوە (دەسڕێتەواو لادەبات)، منسوخ واتا نەسخ کراو (سڕاوەو لابراوە) بەم شێوەیە هەردووکیان لەیەکتر جیا دەکەینەوە.

**دووەمیان:** زانینی تەشریعی ئیسلامیی و هەنگاوەکانی تەشریع واتا: کاتێك کە دەبینین بەچەند هەنگاوێك ریبا (سوو)حەرامبووە بەچەند هەنگاوێك خەمر (مەی-شەراب) حەرام بووە لەوەوە دەزانین کە تەشریعی ئیسلامیی چۆن هەنگاو بەهەنگاو چۆتە پێشەوە.

**سێیەمیان:** سوودی لێوەردەگرین بۆ زانینی تەفسیر بۆ ئەوەی بزانین سەرەتا چی بووە دواتر چۆن گۆڕاوەو دەتوانین تەفسیرو حوکمەکانی لێوەرگرین.

**چوارەمیان:** ئەوە دەردەبڕێت کە موسڵمانان هەر لەسەرەتاوە گرینگیان داوە بەقورئانو زانیوویانە کە ئەم ئایەتە پێشتر دابەزیوەو لەهەر بابەتێکدا چەند ئایەت دابەزیوە ئایەتی ئەوەڵو ئاخیر(سەرەتاو کۆتا) چی بووە.

**پێنجەمیان:** زانینی سیرەی (ژیاننامە)ی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و پۆلێنکردن و ڕیزبەندکردنی ڕووداوەکان؛ چونکە دەزانین ئەم ڕووداوە پێش ئەوە بووە ئەمەیان پێش ئەوە بووە بۆ زانینی پێشینو دواینی ئایەتەکان زیاتر ڕیزبەندی ژیانی پێغەمبەری خودامان (ﷺ) بۆ دەردەکەوێت لەگەڵ ڕووداوەکانی ناو قورئاندا.




## قورئانی پیرۆز چەند بەشی هەیە لە ڕووی هۆکاری دابەزینەوە ؟

**و-** تەبعەن دەبینین قورئان دەکرێتە بەدوو بەشەوە «بەشێکیان کە دابەزیوە؛ بەبێ هۆکار خودای گەورە داییەزاندووە؛ بەبێ هۆکار؛ ئەمەش کە زۆرینەی قورئانە بەم شێوەیەیە، واتە: هیچ پەیوەندییەکی نییە بە هۆکارێکی تایبەتەوە «بەشی دووەم ئەمەشیان کە دابەزیوە بەهۆی هۆکارێکی تایبەتەوە بووە کە پێی دەوترێت «أسباب نزول» واتا: هۆکارەکانی دابەزین؛ ئەمانیش ئەو ئایەتانەن کە هۆکارێك هەیە بۆ دابەزینیان ..



## (سبب النزول) هـۆکاری دابەزین واتای چــییە؟

وـ (سبب النزول) یاخود هۆکاری دابەزین ئەوەیە کە قورئان لەبەر ئەو هۆیانە لەکاتی ڕوودانیان دابەزیوە، وەکو ڕووداوێك، یاخود پرسیارێك کە لەبەر ئەو ڕووداوە، یاخود ئەو پرسیارە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دابەزیون ..



## چۆن ئاشنابین بە هۆکارەکانی دابەزینی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز؟

وـ دەبێت ئەوە بزانین کە «(سبب النزول) » نازانرێت (تەنها) لە ڕێیی (هاوەڵان)ەوە نەبێت لەڕێی ڕیوایەتو سەنەدەوە نەبێت کەس ناتوانێت لە خۆوە بڵێت ئەم ئایەتە بۆ ئەوە دابەزیوە (بەتەنها) دەبێت سەنەدێك هەبێت (هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ) بڵێن کە خۆیان ئاگاداربوونو ئامادەی دابەزینی سرووشبوون ئەوان بەئێمەی ڕابگەینن کە ئەم ئایەتە بەو هۆکارەوە دابەزیوە واتا زانینی (هۆکاری دابەزینی) تەنها بە (گێڕانەوە) ڕیوایەتو بەسەنەدی حەدیث دەبێت بەهیچ شێوەیەك بە (هەوڵی تاکەکەسیی) ئیجتیهادو بەبێ زانینی لە ڕێی سەحابەوە، ناکرێت بزانین چۆن دابەزیوەو هۆکاری دابەزینی چی بووە .



## شێوازەکانی باسکردنی أسباب نزول(هۆکاری دابەزین) چۆنەو بەچی شێوازێك باس دەکرێت؟

و- یەکەمیان بەدەقێکی ئاشکرا کە بە ڕاشکاوی هۆکارەکان باس دەکات بەوە دەزانین ئەمە سبب (هۆکاری دابەزینەکەیەتی)، بۆ نموونە: (هاوەڵێك) بڵێت هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوە بووە، یاخود ڕووداوێك باس بکات دواتر بڵێت یەکسەر(ڕاستەوخۆ) ئەم ئایەتە بۆ ئەم (بابەتو باسە) دابەزیوە یان ئەم شتە ڕوویدا ئایەتەکەش دابەزی؛ کەواتە بەڕاستەوخۆ دەزانین ئەمە شێوازی دابەزینی قورئانە.

شێوازی دووەمیش شێوازی باسکردنی (هۆکاری دابەزینەکە) دەقێکی وابێت کە ئەگەری ئەوەی هەبێت کە سەبەب نزولەکە ئەوە بێت، وەکو دەوترێت لەلایەن (هاوەڵانەوە) ئەم ئایەتە دابەزیوە بۆ ئەمەو ئەوە، یان پێم وایە ئەم ئایەتە بۆ ئەوە دابەزیوە، یاخود وا دەزانم کە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە ئەم ڕووداوە بوو بێت بەم شێوازانە دەزانین ئەمە (هۆکاری دابەزینە).



## ئێمە چۆن دەتوانین هۆکاری دابەزینەکان دیاری بکەین ؟

و- یەکەم: کاتێك دەوترێت ئەم ئایەتە بۆ ئەو ڕووداوە دابەزیوە دەبێت لە (کاتو سەردەمیی) دابەزینی سرووشدا بووبێت ئەم ڕووداوە لەسەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بووبێت ناکرێت بڵێین ئەم ئایەتە دابەزیوە بەهۆی فڵانە شتەوە کە ئەو شتە لە ئێستادا ڕوویداوە.

**دووەمیان:** کاتێك کە دەڵێن ئەمە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەیە دەبێت ئایەتەکە دوای ڕووداونی ڕووداوەکە دابەزیبێت نەک پێشی.

**سێیەمیان:** دەبێت لە ڕیوایەتەکەدا ئەوە هەبێت کە بەڵگەیە لەسەر دابەزینی ئەو ئایەتە، وەک بینینی (هاوەڵان)، یاخود شێوازێك هەبێت بیسەلمێنێت دابەزینی ئەم ئایەتە بەو هۆکارەوە بووە ..



## ٣٥ بەناو بانگترین ئەو کتێبانەی کە باسی أسباب نزول (هۆکارەکانی دابەزین) دەکات چین ؟

**و- یەکەم:** کتێبی ( أسباب النزول) علی بن أحمد الواحدی.

**دووەم:** کتێبی ( العجاب فی بیان الأسباب) ابن حجر العسقلانی.

**سێیەمیان:** کتێبی ( لباب النقول فی أسباب النزول ) جلال الدین السیوطی



## ٣٦ حوکمی قسەی (هـاوەڵ) چییە لە (أسـباب النزول) ( هـۆکاری دابەزیندا)؟

**و-** (زانایان) لەسەر ئەوە کۆڕاو هاودەنگن کە وتەی سەحابیی (هاوەڵ) جێگای ئیعتیبارە (سەرنج و گرنگیی پێ دانە)و بەهەند وەردەگیرێت لە هۆکاری دابەزینداو حوکمی (مرفوع)ی هەیە بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) ؛ چونکە (هاوەڵ) لەخۆیەوە قسە ناکاتو مەسەلەی ئیجتیهادی (هەوڵی تاکە کەسیی) نییەو هاوەڵ خۆی ژیاوە لەگەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆیە کاتێك هاوەڵێک بڵێت ئەو شتە بۆ ئەوە دابەزیوە

دیارە خۆی بینوویەتی، یان پێی وتراوە بۆیە لەخۆیەوە قسە ناکات گەر زانیاریی پێ نەبێت .



## ٣٧ ئایا قسەی شـــوێنکەوتەی هـــاوەڵان (تابعین) وەردەگیرێت لە (هۆکاری دابەزین)،(أسباب النزول)دا ؟

و- بەڵێ وەردەگیرێت، بەڵام بەچەند مەرجو ڕێکارێك:

مەرجی یەکەم: گوزارشتی ئەو تابیعیە(شوێنکەوتووە) ڕاستەوخۆو بەئاشکرا بڵێت ئەمە سەبەب نزولی ئەم ئایەتەیە.

مەرجی دووەم: دەبێت ئیسنادێکی (تەواوو ڕاست) هەبێت کاتێك دەڵێن ئەم تابیعیە(شوێنکەوتەیە) وای وتووە دەبێت سەنەدەکە صحیح (ڕاستو تەواو) بێت.

مەرجی سێیەم: پێویستە ئەو تابیعیە(شوێنکەوتەیە) لە پێشەوایانی تەفسیربێت.

مەرجی چوارەم: دەبێت ئەو قسەی ئەو تابیعیە لە تابیعی تریشەوە هاتبێت کە هەمان ئەو مەرجانەی پێشووی تێدا بێت.



## ٣٨ سەرچاوەکانی زانینی هۆکاری دابەزین چین لەکوێی بگەڕێین بۆ هۆکاری دابەزین ؟

و- **یەکەم:** لە کتێبەکانی «حدیث» (فەرموودە) دا لەوانەش: کتێبی صحیحی «البخاری و مسلم «چوارسونەنەکەو موسنەدی ئیمامی ئەحمەد.

**دووەم:** لە کتێبی تەفسیردا کە باس لە (هۆکاری دابەزین) دەکات، وەك: تفسير الطبري وتفسير ابن أبي حاتم، تفسير ابن كثير، تەفسیر البغوي، هەر تەفسیرێك كە بەسەنەدەوە باسی لێوە كردبێت ئەوە أسباب نزولی لێ وەردەگیرێت.

**سێیەم:** لە (پەرتووکەکانی هۆکاری دابەزین) خۆیداوەک کتێبی سیرەو مێژوو: کتێبی سیرە: (ژياننامە)ی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کتێبە مێژوویەکانیش، وەکو: سیرەی ابن هشام ، ابن اسحاق تاريخ الطبري .




## هەڵوێستی موفەسیر(ڕاڤەکار) چییە کاتێك کە دەبینێت چەند ڕیوایەتێك (گێڕانەوەیەک) هەیە لەسەر دابەزینی یەك ئایەت ؟

**و-** هەرکاتێك چەند ڕیوایەتێك (گێڕانەوەیەك) هەبوو لە دابەزینی یەك ئایەتدا ئەگەرەکان لەم پێنج حاڵەتە بەدەرنین.

**یەکەم:** ئەگەر هاتوو شێوازی باسکردنی ئایەتەکە ڕاستەوخۆ نەبوو؛ نەیوتبوو ئەم ئایەتە بۆ ئەوە دابەزیوە، بەڵکو شێوازێکی ناڕاستەوخۆبوو، ئاشکرا نەبوو ئەوکاتە ئەم وتەیە تەنها تەفسیرە (ڕاڤەیە)واتە: مەبەست پێی تەفسیرە ئەمەش پێی ناوترێت أسباب النزول.

**دووەم:** ئێمە چەند شێوازو ڕیوایەتێکمان (گێڕانەوەیەك) هەیە ڕیوایەتێکمان هەیە سەریحە (گێڕانەوەیەکی ئاشکراو ڕاستەوخۆو ڕوونو دیار) ڕیوایەتێکمان هەیە غەیر سەریحە(گێڕانەوەیەکی ناڕاستەوخۆو نادیار) ئیدی لەو کاتەدا ئەوەیان پێش دەخەین کە دەقێکی ڕاستەوخۆیە کە ئەڵێت (هۆکاری دابەزینەکە) ئەوەیە.

**سێیەم:** ئەگەر هاتوو کۆمەڵێك ڕیوایەتمان (گێڕانەوە)هەبوو، هەموویان سەریح (ڕاستەوخۆو دیار)بوون بۆ نموونە بڵێن ئەم ئایەتە بەهۆی ئەمەوە دابەزیوە لەو کاتەدا دەبینین کامە ڕیوایەت سەحیحترە (لەڕووی سەنەدەوە) کار بەوەیان دەکەین جگە لەوانیتر.

**چوارەم:** ئەگەر هاتوو هەموو ڕیوایەتەکان لە صیحجەتدا(هەموو گێڕانەوەکان لە ڕاستەو دروستییدا) وەکو یەك وابوون بەڵام بوارێك هەیە کە وادەکات ئەم حدیثە(فەرموودەیە) پێشخەین ئەوەیش ئەوەیە ئەگەر هاتوو کەسێك خۆی یەکێك لەم ڕیوایەتانە بگێڕێتەوەو بڵێت: «من خۆم بەچاوی خۆم بینیوومە کە ئەو ئایەتە دابەزیوە بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ)»، یاخود یەکێك لە ڕیواتەکان سەحیحترە؛ چونکە صحیحمان (ڕاستەو دروست)مان هەیە ئەسەحتریشمان(ڕاستتریش) هەیە ئەو کاتەش ئەو ڕیوایەتەی کە لە هەموویان سەحیحترە(ڕاستەو دروستترە) ئەویان پێش دەخرێت.

**پێنجەم:** ئەگەر هاتوو هەموو ڕیوایەتەکان(گێڕانەوەکان)یەکسانبوون بەسەر یەکترییان زاڵ ناکەین، بەڵکو جەمعیان دەکەین(پێکەوە کۆیان دەکەینەوە - لێکیان دەدەین)و، دەڵێین: دەکرێت هەر ئایەتێك چەند جارێك دابەزی بێت، هەر جارێ بۆ بابەتێك، دەکرێت ئایەتێك زیاتر لە چەند هۆکارێکی هەبێت بۆ دابەزینی ..



## سوودی زانینی أسباب نزول (هۆکاری دابەزین) چییە ؟

**وـ** چەند سوودێکی هەیە:

**یەکەم:** بەهــــۆی زانینی (هــــۆکاری دابــــەزین)ەوە ئاشنا دەبین بە حیکمەتەکانی تەشریع.

**دووەم:** زانینی ئەو کەسەی کە ئایەتەکەی بەسەردا دابەزیوە.

**سێیەم:** هاوکاریمان دەکات بۆ تێگەیشتنی قورئان.

**چوارەم:** بۆ ئەوەی بەئاسانی بزانرێت کە ئەم ئایەتە بۆچی دابەزیوە بەهۆی چ هۆکارێکەوە دابەزیوە.

**پێنجەم:** بەهۆی زانینی ســـەبەب نزول (هۆکاری دابەزینەوە) هەر گرفتێکمان هەبوو لە تێگەیشتنی ئایەتەکە نائومێدمان ناکات؛ چونکە دەزانین ئایەتەکە باسی ئەو ڕووداوە دەکاتو ئەو ڕووداوە ڕوون دەکاتەوە .



## مەبەست لە سورەتی مەککییو سورەتی مەدەنیی چییە ؟

**وـ** زانایان بۆ دابەشکردنی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز بۆ هەردوو بەشی مەککییو مەدەنیی سێ ڕایان هەیە ئەویش بەبەرچاو گرتنی چەند خاڵێك:

ڕاو بۆچوونی یەکەمیان: کاتی دابەزینی قورئانیان لەبەرچاو گرتووە مەککییو مەدەنییان دابەشکردووە بەپێی کاتی دابەزین کەواتە: هەر ئایەتێك پێش کۆچکردن بۆ مەدینە دابەزی بێت هەمووی ناو دەنێن سورەتە مەککییەکان، هەر سورەتێکیش دوای کۆچکردن بۆ مەدینە دابەزی بێت ئەوە پێی دەڵێن سورەتی مەدەنیی، بەڵام ئەگەر لە مەککە یان مەدینە نەبوو بێت ئەوان تەنها دابەشیان کردووە بەپێی کاتی دابەزینەکەی، ئەمەش ڕای زۆربەی زانایانی تەفسیرە.

ڕاوبۆچوونی دووەمیان: مەککیی و مەدەنییان دابەشکردووە بە بەرچاوگرتنی شوێنی دابەزینەکە ئەوەی لە مەککە دابەزیبێت یان لە دەوروبەری مەککەوە بووبێت لە» میناو عەرەفات و موزدەلیفەو حودەیبیە» ئەمانە هەمووی بە مەککی هەژمار دەکەن، ئەوەشی لەناو شاری مەدینەدا دابەزی بێت، یان لە دەوروبەری شاری مەدینەدا دابەزیبێت وەکو لە»بەدر، یاخود لە ئوحود، یان قوباء» دابەزی بێت ئەمانە پێی دەڵێن مەدەنیی، کەواتە: ئەوان تەنها شوێنی دابەزینەکەیان ڕەچاو کردووە.

ڕاوبۆچوونی سێیەمیان: بەڕەچاوکردنی ئەو کەسانەی کە قورئانەکەیان بۆ دابەزیوە، یان بەڕەچاو کردنی خیطابی قورئان(ئاڕاستەی وتەی ئایەتەکان ڕوو بەڕووی کێ کراوەتەوە) بۆ کەسەکان ئەگەر خیطابی قورئانی بۆ ئەهلی(خەڵکی)مەککە بێت ئەوە مەککییە ئەگەر ڕووی سورەتەکانو ئایەتەکان لە (خەڵکی)مەدینە بێت ئەوە مەدەنییە ..



## ٤٢ چۆن بزانین ئەم سورەتە مەککییە، یان مەدەنییە ؟

وـ دوو ڕێگامان هەیە بۆ ئەوەی بزانین کە ئەم سورەتە مەککییە، یاخود مەدەنییە.

ڕێگای یەکەم: ڕێگایەکی «سەماعیە» (بیستەکیی) واتا: گوێگرتن بەسەنەدەوە کە بیستراوە لە (هاوەڵانەوە) ئەوانەی خۆیان لە زەمەنی (سەردەم و کاتی) دابەزینی سرووشدا ژیاون، یان لە تابیعینەوە (شوێنکەوتوان) کە لە هاوەڵانو سەحابەوە بۆ ئێمەیان ڕیوایەت کردووە (گێڕاوەتەوە)، ئەوان ئەگەر بڵێن ئەم سورەتە لە مەککە دابەزیوە، یان لە مەدینە دابەزیوە بەم شێوەیە دەزانین کە ئەم سورەتە مەککییە، یان مەدەنییە.

ڕێگای دووەم: بەپێی»ئیجتیهاد» (هەوڵدانی خۆیی) واتا: هەندێك سورەت هەیە نازانین هیچ ڕیوایەتێکمان (گێڕانەوەیەکمان) نییە کە باسی دابەزینەکەی بکات، بەڵام بەپێی ئیجتیهاد، واتا: بەپێی تایبەتمەندییەکانی سورەتە مەککییو مەدەنییەکان دەزانین ئەم سورەتە مەککییە، یان مەدەنییە ئەگەر تایبەتمەندییەکانی سورەتە مەککییەکانی تێدابوو ئەوکاتە پێیان دەڵێن: ئەم سورەتە مەککییە، بەڵام ئەگەر تایبەتمەندی سورەتە مەدەنییەکانی تێدابوو ئەو کاتە دەڵێین: سورەتێکی مەدەنییە..



## ٤٣ ئەو سورەتە مەدەنییانە چین کە جێی کۆڕاو هاودەنگیی زانایانە ؟

و ـ بیست سورەتمان هەیە کە ئەم بیست سورەتە جێ ئیتتیفاقی (هاوڕایی) زانایانەو زانایان لەسەری کۆدەنگن کە سورەتی مەدەنیین سورەتەکانیش بریتین لەمانە ( البقرة ـ آل عمران ـ النساء ـ المائدة ـ الأنفال ـ التوبة ـ النور ـ الأحزاب ـ محمد ـ الفتح ـ الحجرات ـ الحديد ـ المجادلة ـ الحشر ـ الممتحنة ـ الجمعة ـ المنافقون ـ الطلاق ـ التحريم ـ النصر ) ئەم بیست سورەتە هەر بیستیان جێی کۆدەنگی زانایانە کە مەدەنیین ..



## ٤٤ ئەو سورەتانە چین کە جێی ڕاجیاوازیی زانایانەو لەسەری کۆدەنگ نین ؟

و ـ دوانزدە سورەتمان هەیە ئەم دوانزدە سورەتە جێی ڕاجیایی زانایانە کە ئایا مەککییە، یاخود مەدەنییە؛ هەردوو ڕاکەش هەندێك دەڵێن: مەککییە هەندێکی دیشیان، دەڵێن: مەدەنییە، سورەتەکانیش بریتین لەمانە ( الفاتحة ـ الرعد ـ الرحمن ـ الصف ـ التغابن ـ المطففين ـ القدر ـ البينة ـ الزلزلة ـ الإخلاص ـ الفلق ـ الناس ) ئەم دوانزدە سورەتەش زانایان لەسەری کۆك نین کە ئایە مەدەنیین یان مەککین ..



## ٤٥ ئەو سورەتانەی کە جێ کۆدەنگی زانایانن کە مەککین چین ؟

و ـ هەشتاو دوو سورەت دەمێنێتەوە جگە لەم سورەتانەی کە باسمان کرد جێگای کۆدەنگی زانایانە کە مەککین ..




## ڕێساکانی زانینی سورەتی مەککیی چییە چۆن بزانین ئەم سورەتە مەککییە ؟

و- کۆمەڵێك خاسییەت هەیە بەوە دەزانین، سورەتە مەککییەکانی پێ دەناسینەوە:

**یەکەم:** ئەگەر هەر سورەتێك وشەی (کلاّ) ی تێدا بوو ئەوە مەککییە.

**دووەم:** ئەگەر هاتوو هەر سورەتێك «سجدة التلاوةی» تێدابوو ئەوە مەککییە.

**سێیەم:** ئەگەر هاتوو هەر سورەتێك دەستی پێکردەبوو بە»سوێند»خواردن ئەوە سورەتێکی مەککییە.

**چوارەم:** ئەگەر هاتوو هەر سورەتێك دەستی پێکردەبوو بە پیتەکانی وەکو ( الم ـ یس ـ ط ) ئەمانە مەککیین، جگە لە ( البقرة ـ آل عمران ) ئەم دووانە بە ئیتیفاق(کۆدەنگیی) مەدەنیین هەرچەندە بە»الم»دەستیان پێکردووە، هەروا سورەتی ( الرعد) جێی خیلافە(ڕای جیاوازە).

**پێنجەم:** گەر هاتوو هەر سورەتێك دەستی پێکردەبوو بە ( يَٰٓأَيُّهَا لنَّاسُ ) و ( يَٰٓأَيُّهَا لَّذِينَ ءَامَنُوا)ی تیانەبوو ئەوە مەککییە (تەنها) سورەتی (الحج) نەبێت کە لە کۆتاییەکەدا ( يَٰٓأَيُّهَا لَّذِينَ ءَامَنُوا )ی تیایە.

**شەشەم:** هەر سورەتێك دەستی پێکردەبێت بە «الحمد» ئەوە سورەتێکی مەککییە.

**حەوتەم:** گەر هاتوو هەر سورەتێك چیرۆکی پێغەمبەرانی تیابێت ئەوە مەککییە جگە لە سورەتی «البقرة » کە سورەتێکی مەدەنییە بە ئیتتیفاق(هاوڕایی زانایان).



## ٤٧ تایبەتمەندییەکانی سورەتە مەککییەکان چین ؟

**و- یەکەمیان:** سورەتە مەککییەکان گرینگی دەدات بە دامەزراندنی بیروباوەڕی ئیسلامیی لە ناخی بەندەکانی خوداداو بانگەشە دەکات بۆ یەکتاپەرستییو باوەڕهێنان بە پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەر محمد(ﷺ) هەروەها ڕۆژی دواییو بابەتەکانی تری عەقیدە(بیروباوەڕ).

**دووەمیان:** سورەتە مەککییەکان باسی بنەماکانی خوداپەرستییو مامەڵەکردنو ئادابو ڕەوشتە بەرزەکان دەکات باسی ئوصوڵی عیبادەتەکان (بنەچەو بنچینەی بەندایەتییەکان) دەکات، نەك باسی تەفاصیلەکەی(وردەکارییەکەی).

**سێیەمیان:** سورەتە مەککییەکان گرینگی دەدات بە تەفصیلی(وردەکاریی) چیرۆکی پێغەمبەران بەدرێژیی باسی چیرۆکی پێغەمبەرانو گەلەکانی پێش ئیسلام دەکاتو باسی شێوازی بانگەواز دەکات لەلایەن پێغەمبەرەکانی پێش پێغەمبەری خۆمانو باسی هەڵوێستی ئەو نەتەوانە دەکات بەرامبەر پێغەمبەرەکانیان.

**چوارەمیان:** سورەتە مەککییەکان کورتن، لەهەمان کاتدا ئایەتەکانیشی، لەگەڵ بەهێزیی وشەکانو کورتیی ڕستەکانو بەرزیی لە ڕەوانبێژییو معنا(واتا)و گەیاندا؛ زێتر سورەتە مەککییەکان لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە وشەکانی لەوپەڕی بەرزی دان ..




## ڕێساکانی ناسینەوەی سورەتە مەدەنییەکان چـــین چۆن بزانین ئەم سورەتە مەدەنییە ؟

**و- یەکەمیان:** هەر سورەتێك ( يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا )ی تێدابێت و ( يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ )ی تێدا نەبێت ئەوە سورەتێکی مەدەنییە.

**دووەمیان:** هەر سورەتێك باسی (دووڕووەکان) منافقینی تێدابێت ئەوە مەدەنییە.

**سێیەمیان:** هەر سورەتێك باسی فەڕزەکانی تێدا بێت یاخود باسی حەددێکی شەرعیی(کە سزایەکی دانراوە بۆ تاوانێکی دیاریکراوە لە شەرعدا) تێدا بێت ئەوە سورەتێکی مەدەنییە.

**چوارەمیان:** هەر سورەتێك خیطابی تێدا بێت بۆ ئەهلی کیتاب( ڕووگەو مەبەست لە وتەکە بەرەوڕووی گەلێکی خاوەن پەرتووکی ئاسمانیی بێت وەك: جووەکان، گاورەکان) دەستپێبکات بە (یا أهل الکتاب ) یان (يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ) ئەوا ئەو سورەتە مەدەنییە.

**پێنجەمیان:** هەر سورەتێك ناوی «الیهود» ی تێدابێت بە ناسراویی بە ئەلیفولامی تەعریفەوە یاخود «النصاری» بە ئەلیفولامی تەعریفەوە ئەوە سورەتێکی مەدەنییە.

**شەشەمیان:** هەر سورەتێك باسی جیهاد(جەنگ لە پێناو خودا) بکات و باسی ئەحکامی جیهاد (یاساو ڕێساکانی جەنگ لەپێناو خوداو ئایینەکەی) بکات، یاخود باسی غەزا بکات، ئەوە سورەتێکی مەدەنییە.




## تایبەتمەندییەکانی سورەتە مەدەنییەکان چین ؟

**و- یەکەمیان:** سورەتە مەدەنییەکان بەدرێژی باس لە ئەحکامە شەرعییەکان (یاساو ڕێساکان) دەکەن واتا ئەحکامەکانی عیبادات (یاساکانی بەندایەتیی) و خوداپەرستییو مامەڵەکردن و سزاکان و میرات .. هتد. بەدرێژیی ئەم ئەحکامە شەرعییانەمان بۆ باس دەکەنو ڕوون دەکەنەوە.

**دووەمیان:** سورەتە مەدەنییەکان پەردە لەسەر دووڕووەکان هەڵدەماڵنو بەخەڵکییان دەناسێننو کەشف(ئاشکرایان) دەکەنو سروشتو سیفات(ڕەشت)و پلانەکانیان بۆ دژی ئیسلامو ئەهلی ئیسلام (خەڵکی موسڵمان)دەردەخەن.

**سێیەمیان:** لە تایبەتمەندییەکانی سورەتە مەدەنییەکاندا گفتوگۆکردنە لەگەڵ «ئەهلی کیتاب(گەلی خاوەن پەرتووکی ئاسمانیی) نصاری (گاور)، لەگەڵ یەهودییەکان (جووەکان) بەتایبەتو پووچەڵکردنەوەی بیروباوەڕەکانیانو ڕوونکردنەوەی داسکاریکردنو تەحریفکردنی ئەوانە بۆ کتێبەکانیان (بەلاڕێدابردنو گۆڕینیی ناوەڕۆکی پەیامی خودایی)و بانگکردنە بۆ ئیسلام بە بەڵگەو حوججەوە.

**چوارەمیان:** لە تایبەتمەندییەکانی سورەتە مەدەنییەکان درێژی بڕگەو سورەتەکانییەتی بۆ نموونە سورەتی «البقرة» کە دوو جوزئو نیوەو سورەتی( آل عمران ـ النساء ـ المائدة ) ئەمانە هەمووی سورەتی درێژن، کەوایە لە تایبەتمەندیی سورەتە مەندەنییەکان درێژی سورەتو

ئایەتەکانییەتی؛ چونکە بۆ ڕوونکردنەوەی عەقایدو ئەحکامە(بیروباوەڕو ئاساو ڕێساکانە)و کۆمەڵگەش پێویستی پێیەتی ..



## ٥٠ سوودی زانینی سورەتە مەککیی‌و مەدەنییەکان چییە ؟

**وـ یەکەمیان:** سوودی هەیە بۆ زانینی ناسخ‌و منسوخ (لابەرو لابراو) جیا کردنەوەیان لەیەکتری ، کامیان لەپێشترەو لە مەککە بووەو کامیان لە مەدینە بووە، کەواتە: ئەو حوکمەی لە مەدینەیە حوکمی مەککە نسخ دەکاتەوە(پووچەڵی دەکاتەوەو لای دەبات).

**دووەمیان:** سوودی لێ دەبینین بۆ تەفسیری قورئان دەزانین ئەمە لەوێ دابەزیوە ئەمە بۆ ئەوێ دابەزیوە بۆ تێگەیشتن سوودی هەیە بۆمان.

**سێیەمیان:** سوودی لێ دەبینین بۆ فێربوونی شێوازی بانگەواز بۆ لای خودا؛ چونکە شێوازی بانگەوازی مەککە جیاوازە لە شێوازی بانگەوازی مەدینە.

**چوارەمیان:** سوودی لێ دەبینین بۆ دەرهێنان‌و هەڵهێنجانی ژیاننامەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)کە لە مەککە چۆنبووە چی بۆ دابەزیوە، لە مەدینە چۆنبووە.

**پێنجەمیان:** هەروەها بەڵگەشە لەسەر گرینگیدانی موسڵمانان بەقورئان لە سەرەتاوە هەر لە سەحابەوە گرینگیانداوە بەم بابەتە؛ چونکە قورئانی پیرۆز جێگای بایەخ‌و گرینگیدانی سەحابە(هاوەڵان)و ئەهلی ئیسلامبووە (مرۆڤی موسڵمان) بە درێژایی مێژوو لەهەموو بوارەکانی قورئاندا کۆڵیونەتەوە ئەمەش یەکێکە لە بوارەکانی قورئان.

**شەشەمیان:** له ڕێی زانینی مەككیی‌و مەدەنییەوە هەندێک جار ڕای بەهێزو بێهێزمان بۆ دەردەكەوێت له بۆچوونی زانایانی تەفسیرا.

## ٥١ فەزائیلی قورئان مانای چییەو بابەتەكانی چییە ؟

**وـ** مەبەستمان له «فەزائیل»واتا ڕێزو شكۆی قورئانی پیرۆز و پلەو سیفەتە بەرزەكانی قورئان. فەزائیل بریتیە : لەو خاسیەت‌و سیفەت‌و شكۆو بەرزییەی كه لەبارەی ئیسلام‌و قورئانی پیرۆزەوە هاتووە چ له بەشێك له قورئان، یان هەموو قورئان، وەكو بەڵگەیەك‌و ڕوونكرەوەیەك بۆ شكۆو شەڕەف‌و سوودو قازانجی قورئان بۆ دنیاو قیامەت، بابەتەكانیشی بریتیە له:

**یەكەمیان:** فەزائیله گشتیەكان له سیفەتە بەرزەكان‌و پله بەرزەكانی قورئان بەشێوەیەكی گشتیی.

**دووەمیان:** باسكردنی فەزڵ‌و شكۆی ئەهلی قورئان‌و هەڵگرانی قورئان.

**سێیەمیان:** فەزڵ‌و شكۆو گەورەیی سورەت‌و ئایەتەكانی قورئان.

## ٥٢ گرینگی زانینی فەزائیلی قورئان چییە ؟

**وـ یەكەمیان:** زانینی گەورەیی قورئان دەبێتە مایەی ئەوەی مرۆڤ لەناخی خۆیدا زیاتر قورئان بەگەورە دابنێت‌و پلەوپایەو شكۆو گەورەیی قورئانی پیرۆزی لەدڵا زیاتر دەكات.

**دووەمیان:** هاندەرێكی باشە بۆ فێربوونی قورئان‌و تێڕامان‌و فێربوونی ماناكان و ئیشوكار پێ كردنیی‌و خوێندنەوەو لەبەركردن و گوێ بۆ گرتنی.

**سێیەمیان:** سوود لێ وەرگرتنییەتیی بۆ بانگەوازکردن بۆ قورئانی پیرۆزو بانگەوازکردن بۆ لای خودای گەورە کە بزانن قورئان ئەوەندە گەورەیە، گەورەترین سەرچاوەیە بۆ بانگەوازکردن بۆ لای خودای پەروەردگار.

**چوارەمیان:** زانینی گەورەیی قورئان ئەوەمان بۆ دەردەخات کە قورئان لە هەموو کتێبەکان گەورەترە شایەنی گرنگیپێدانەو هیچ کتێبێك نییە هێندەی قورئانی پیرۆز زانستو مەعریفەتی(زانیاریی) لەخۆ گرتبێت .



## ٥٣ فەزڵی قورئانی پیرۆز چییە بەسەر کتێبە ئاسمانییەکانی تردا ؟

**یەکەمیان:** قورئان ناسیخە(لابەرە)و هەموو کتێبەکانی پێش خۆی نەسخ کردۆتەوەو حوکمی هەموو ئەو کتێبانەی پێش خۆی سڕیوەتەوە، هیچ کتێبێکی دی کاری پێناکرێت دوای قورئانی پیرۆز.

**دووەمیان:** قورئان لە پیرۆزترین شوێنی سەر زەویی دابەزیوە ئەویش (مەککە)یە کە ئەمە بۆ هیچ کتێبێکی دی نییە.

**سێیەمیان:** خودای گەورە خۆی بەڵێنیداوە کە ئەم قورئانە بپارێزێت لە هەموو دەستکارییەك بەڵام ئەمەی نەداوە بە کتێبەکانی دی، هەروەك خودای پەروەردگار ئەفەرموویت ( إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ )

**چوارەمیان:** فەزڵی قورئان بەسەر کتێبەکانی تردا ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز بوارەکانی ئیعجازی زیاترە، قورئان لە زۆر ڕووەوە جێگای دەستەوەسانکردنی مرۆڤە مرۆڤ بەرامبەر بە گەورەیی ئەم کتێبە لە ڕووی ئەحکام و تەشریعەوە (ڕێساو بەیاساکردن) لە ڕووی عەقیدەوە (بیروباوەڕ) لە ڕووی ئابوریی‌و پەروەردەوە لە ڕووی کاروباری ژیانو

خێزانەوە لە ڕووی ئیعجازی زانستییەوە سەسام دەبێت، هەموو ئەمانە جیاوازی قورئانە لەگەڵ کتێبەکانی ترا.



## ٥٤ فەزڵ و گەورەیی خوێندنەوەی قورئـان چییە کە لە قورئـــان و سوننەتدا هاتبێت ؟

وـ بێگومان بەڵگەمان لە ئایەتو فەرموودەکاندا زۆرن لەسەر فەزڵی ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێتەوە، بەڵام لێرەدا چەند نموونەیەك باس دەکەین، خودای گەورە ئەفەرموویت ( إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ)(٢٩) «واتە: ئەوانەی کە قورئان دەخوێننەوەو نوێژەکانیان بە باشترین شێوە ئەنجامداوەو لەوەی کە پێماندراون بە نهێنییو ئاشکرا دەبەخشن بازرگانییەک داوا دەکەن کە هەرگیز زیانی بەر ناکەوێت.

( لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ )فاطر (٣٠)» واتە: بۆ ئەوەی خودا بەباشترین شێوە پاداشتیان بداتەوەو بە بەخشندەیی خۆی زێتر بەهرەمەنیان بکات، بەڕاستی خودا لێبوردەیە بەرامبەر گوناهی گەورەیان و بە بەخشینی زۆر بەرامبەر بەکەم بەندەکانی سوپاس دەکات.

"لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوداش (ﷺ) کە ئیمامی (الترمذی) گێڕاویەتییەوە: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا لاَ أَقُولُ الم حَرْفٌ وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ وَلاَمٌ حَرْفٌ وَمِيمٌ حَرْفٌ) « الترمذي/ ٢٩١٠ واتا: ئەوەی پیتێك لە کتێبەکەی خودا بخوێنێتەوە ئەوا چاکەیەکی بۆ هەیە، چاکەش

به ده ئەوەندەی خۆیەتی، من نالێم (الـم) پیتێکه، بەڵکو(أ) پیتێکەو (ل) پیتێکەو(م) یش پیتێکه.

## ٥٥ پاداشتی گوێگرتن له قورئـــان چییه ؟

و- پاداشتی گوێگرتن لەقورئانی پیرۆزو گەورەیی گوێگرتن لەقورئان هەروەك خودای گەوره دەفەرمووێت (وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ) الأعراف (٢٠٤) «واته: کاتێك که قورئان خوێندرا دەبێ گوێی لێ بگرنو بێدەنگیشبن بۆ ئەوەی خودا میهرەبانیتان لەگەڵدا بکات. پێغەمبەری خوداش(ﷺ) ئەفەرمووێت ( من استمع إلى آية من كتاب الله عز وجل، كتب له حسنة مضاعفة، ومن تلاها كانت له نورا يوم القيامة «) اخرجه احمد /٨٩٩٤

"واتا: هەر کەسێك گوێ بگرێت بۆ ئایەتێك له قورئان خودای گەوره چاکەیەکی بۆ دەنووسێت بەچەند قات (چەند ئەوەندە) هەر کەسێك ئایەتێك له قورئانی پیرۆز بخوێنێتەوە؛ بۆی دەبێت به نوورێك له ڕۆژی دواییدا ).

## ٥٦ سوودو پاداشتی کۆبوونەوە بۆ خـــوێندنەوەی قورئـــانی پیرۆز چییه ؟

و- پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت ( وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ، يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلَّا نَزَلَتْ عَلَيْهِمِ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَحَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ) « رواه

مسلم/٢٦٩٩ واتە: هەر کاتێك کۆمەڵێك کۆبوونەوە لەماڵێك لە ماڵەکانی خودای پەروەردگار قورئان بخوێننەوە بەیەکەوە موتاڵای بکەن؛ لە ماناکەی بکۆڵنەوەو فێری خوێندن‌و خوێندنەوەی بن؛ ئیلا(مەرجە) ئارامیی‌و سەکینەتی خودایی(ئاسودەیی) بەسەریاندا دەبەزێت میهرو بەزەیی خودای پەروەردگار دایان دەپۆشێت؛ فریشتەکان بە باڵەکانیان دایان دەپۆشن خودای پەروەردگاریش لەئاسماندا یادیان دەکات .



## فەزڵی ئەو کەسە چییە کە قورئانی پیرۆز فێر دەبێت‌و خەڵکیش فێر دەکات ؟

و- پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەفەرمووێت: (خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ )» رواه البخاري/٥٠٢٧ واتا: باشترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێردەبێت‌و خەڵکیش فێردەکات ..



## ئادابەکانی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز چین ؟

و- بێگومان کۆمەڵێك ئاداب(ڕەوشت)مان هەیە، هەندێك لە زانایان کۆمەڵێك کتێبیان نووسیوە سەبارەت بە ئادابی خوێنەری قورئان:

**یەکەمیان:** پاکیی لاشەو شوێن‌و جلوبەرگ‌و دەم‌و ددان.

**دووەمیان:** دەبێت بەدانیشتنەوە قورئانی پیرۆز بخوێنێت(وەکو ڕێزێك) تەنها لە نوێژدا نەبێت؛ چونکە لە نوێژدا بەپێوە قورئان دەخوێندرێت، بەڵام هەرچەندە بەڕاکشان حەڕام(قەدەغەو تاوان) نییە، بەڵام ئەدەب وایە مرۆڤ بە جوانترین شێوە دابنیشێت لەخزمەتی قورئانی پیرۆزدا.

**سێیەمیان:** لەسەرەتای قورئاندا بڵێت: ( أعوذ بِاللّهِ مِنَ الشّيْطَانِ الرّجِيمِ )

**چوارەمیان:** (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بکات دوایـــی (أعوذ بِاللّهِ مِنَ الشّيْطَانِ الرّجِيمِ)

**پێنجەمیان:** هەوڵبدات دەنگی خۆی خۆش بکات، قورئان بڕازێنێتەوە؛ چونکە قورئانی پیرۆز خۆی ڕازاوەیە بەدەنگی خۆش .

**شەشەمیان:** قورئان بخوێنێتەوە بە ترتیل و بەهێمنیی و لەسەرخۆیی.

**حەوتەمیان:** قورئان بخوێنێتەوە بە تێڕامان و لێتێگەیشتن لە ئایەتەکان ..



## ٥٩ دیارتـرین ئەو کتێبانە چـــییە کە لەبارەی فــەزائیلی قورئـــانی پیرۆزەوە نووسراوە ؟

**وـ** ئەو کتێبانەی کە باسی فەزڵی قورئان ئەکەن

« فضائل القرآن »»النسائی"

«فضائل القرآن » «ابن کثیر الدمشقی»

«فضائل القرآن »»ابن حجر العسقلانی»

« فضائل القرآن » کە یەکێکە لە کتێبە کۆنەکان هی ئەبو عوبەید قاسمي کوڕی سەلام «ئەمانە کۆمەڵێك کتێبن سەبارەت بە فەزائیلی قورئانی پیرۆز .



## ٦٠ ئەو كتێبانە چين كە باسى ئـادابەكانى ئەهلى قورئـانى پيرۆز دەكەن ؟

وـ كتێبى « آداب حملة القران »)) ئيمامى ئاجوريى « التبيان فى آداب حملة القران » ئيمامى نەوەوى ڕەحمەتى خودايان لىٰ بێت ..



## ٦١ سيفەتە بەرزەكان‌و خاسيەتە بەرزەكانى قورئانى پيرۆز چييە ؟

و / **يەكەميان:** قورئانى پيرۆز خوداى گەورە دەيپارێزێت لە سينگى قورئانخوێنەكاندا؛ كە لەپێش ئيسلامدا هيچ كەسێك نەبووە لە سينگيدا تەورات، يان ئينجيلى پاراستبێت، بەڵام بەدرێژايى مێژوو بە مليۆنەها كەس‌و ئێستاشى لەگەڵدا بێت لە سينگى خۆياندا قورئانيان پاراستووە.

**دووەميان:** قورئانى پيرۆز كە گەيشتووە بە ئێمە فريشتەكان نەبێت كەس دەستى پێنەگەيشتووە كە لەلايەن خوداوە هاتووە بۆ ئێمەو باشتريش وايە كە موسڵمان بەدەستى پاكەوە نەبێت دەست نەبات بۆ قورئانى پيرۆز.

**سێيەميان:** خوداى گەورە بەڵێنى داوە كە دەيپارێزێت.

**چوارەميان:** قورئان دەبێتە شەفاعەتكار(تكاكار) بۆ قورئانخوێنان‌و ئەهلى قورئان.

**پێنجەميان:** قورئانى پيرۆز نادرێتە پاڵ غەيرى خودا، بەڵكو (وتەى) خوداى پەروەردگارە، وەكو هەندێك كتێب نييە بوترێت: ئينجيلى

لۆقا، ئینجیلی یوحەنا، بەڵكو قورئان قورئانی خودایە» كلام الله» لە ئامادەكردنی هیچ كەسی دی نییە، وەكو كتێبەكانی دی، بۆیە زۆربەی كتێبەكان دەدرێتە پاڵ كەسێكی دی لە پیاوچاكان، یان یەكێك لە پێغەمبەران، وەكو دەوترێت ئینجیلی یوحەنا، ئینجیلی مەرقەص، ئینجیلی بەرنابا، ئاڤێستای زەردەشت.

**شەشەمیان:** ئاسانكردنی لەبەركردنو خوێندنەوەی، خودای گەورە ئاسانی كردووە بۆ خەڵكی گەر یەكێك بیەوێت، بۆیە دەبینین زۆركەس هەن زمانی عەرەبی نازانن، بەڵام قورئانیشیان لەبەركردووە.

**حەوتەمیان:** قەدەغە كراوە كە بە مانا بگێڕدرێتەوە دەبێت بە دەق لەبەری بكەیت (دەقاودەق ئەزبەر بكرێت).

**هەشتەمیان:** ئەو قورئانە پیرۆزە زاڵە بەسەر هەموو كتێبەكانی تردا؛ هیچ كتێبێك نییە بتوانێت شان لە شانی قورئانی پیرۆز بدات(هاوشانو هاوئاستی قورئانی پیرۆز بێت).

**نۆیەمیان:** ئەگەر یەكێك زۆر دەستی پێوەنەگرێت(نەیخوێنێتەوەو ویردی نەكات بەبەردەوامیی) زوو لەبیری دەچێتەوە.

**دەیەمیان:** ئەو قورئـــانە پیرۆزە شـــیفایە (چـــارەسەرە) بۆ نەخۆشی (چارەسەریی نەخۆشییە).

**یانزدەیەمیان:** قورئانی پیرۆز ناوو سیفاتی زۆرە.

**دوانزدەیەمیان:** ئەهلی زانست نەهییان(قەدەغە) كردووە لەوەی مرۆڤ قورئان ببات بۆ شوێنێك كە شوێنی »دار الكفر» (خاك و نیشتیمانو

وڵات و شوێنی نیشتەجێبوونی خەڵکی بێباوەڕ)بێت نەکا کافرەکان بەشێوەیەکی ناشیرین مامەڵەی لەگەڵ بکەن.

**سیانزدەیەم:** خوێنەرەکانی قورئانی پیرۆز هیچ کات لەخوێندنەوەی تێر و بێزارنابن .





## مەبەست چییە لەوەی کە قورئانی پیرۆز بە «حەوت» پیت دابەزیوە ؟

**و-** زانایان بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە مەبەست لە(الأحرف السبعة) ئەو حەوت شێوەی کە قورئانی پێ دابەزیوە چوار ڕای جیاوازیان هەیە:

**یەکەمیان:** کە ڕای زۆربەی زانایانە مەبەست لە (الأحرف السبعة) یان حەوت پیتەکە یان حەوت شێوەکە؛ بریتیە: لە حەوت زمان، یاخود حەوت زاراوە کە عەرەب قسەی پێکردووە قورئانی پیرۆز بە هەر حەوت پیتی دابەزیوە، وەکو ئاسانکارییەك بۆ ئەوەی کە تێبگەن تەنها لەو حەوت لەهجەیە(زارەیە)، حەوت زارە کە» قوریش‌و هوزەیل‌و تەمیم‌و حوازین‌و کینانەو ثەقیف‌و یەمەنە» یان ئەڵێن»قوریش‌و هوزەیل‌و تەمیم‌و حوازین‌و ئەزدو ڕەبیعەو سعدی بن بکرە» ئەمەش، وەکو وتمان ڕای زۆربەی زانایانە.

**ڕای دووەمیان:** دەڵێن مەبەست لە (الأحرف السبعة) حەوت ڕووی قورئانە حەوت وەجهە کە بریتیە: لە ئەمرو نەهی لە وەعدو وەعید و جەدەل مەبەستیشمان لە ئەمر: فەرمانەکانی قورئانە نەهیش: قەدەغەکراوەکانی قورئانە وەعد: بەڵێنەکانی قورئانە وەعید: بەڵێنە

ترسناکەکانی قورئانی پیرۆزە کە بەڵێنە بە دۆزەخو بەسزا، هەروەها گفتوگۆ بەچیرۆکو نموونەهێنانەوە، یان وتراوە مەبەست لە ئەمرو نەهیو حەڕامو حەڵاڵو موحکەمو موتەشابیهەکانی قورئانە.

**ڕای سێیەمیان:** دەڵێن مەبەست لە (الأحرف السبعة) ئەو جیاوازیەیە کە لە وشەکانی قورئاندا هەیە، حەوت جیاوازی لەوانەش جیاوازی « ناوەکان لەڕووی تاکو لە ڕووی کۆوە لە ڕووی مذکرو مؤنث «(نێرو مێ)وە جیاوازی لە شێوازی شیکردنەوەو ئیعرابدا ، جیاوازی لە سەرفی قورئاندا، جیاوازی لە پێشخستنو دواخستنی وشەکانو پیتەکانی قورئاندا، جیاوازی لەنێوان گۆڕینی پیتێك بە پیتێك بەپێی زاری عەرەب ، جیاوازی بەزیادەو کەمکردن ؛ بۆ نموونە: ئایەتێك دەڵێن: ئەو پیتەی زیادەی تێدایە ئەو پیتەی کەمترە، واتا: کورتبڕیی تێداکراوە، هەروەها جیاوازیی لە شێوەزارەکان کە هەندێک جار هەندێك وشە لە قورئاندا بەقەڵەویی دەخوێندرێتەوە هەندێك وشە بەناسکیی دەخوێندرێتەوە هەندێك وشە بە فەتح هەندێك وشە بە ئیمالە.

**ڕای چوارەمیان:** دەڵێن مەبەست لەو (الأحرف السبعة) یە ئەو ژمارەیە کە دابەزیوە تەنها ڕەمزێکە (دروشمو هێمایەکە)؛ چونکە ژمارەی (حەوت) لای عەرەب ژمارەیەکی بەڕێزە ژمارەیەکە کەمال (کامڵبوون) دەبەخشێت کە قورئان بەو حەوت وشەیە دابەزیوە، هیچ مەفهومێکی(واتاو مەبەستو تێگەیشتن) نییە مەعنای(واتای) ئەوە نییە قورئان بەحەوت زاری عەرەب دابەزیبێت ..



## ٦٣ ئایا ئەم حەوت زارە لە قورئانی پیرۆزدا ماوەتەوە ؟

**و: یەکەمیان:** هەندێك لایان وایە تەنها لە دوایی نووسینەوەی قورئانی پیرۆز ئەوەی کە لەگەڵ ڕەسمی قورئاندا گونجابێت ئەوە ماوەتەوە، واتا: ئەو وشانە ماوەتەوە لە زاری عەرەب لە (الأحرف السبعة) لەگەڵ نووسینی قورئاندا یەکی گرتۆتەوە.

**دووەمیان:** ڕایان وایە کە تەنها یەك شێوە ماوەتەوە ئەویش شێوازی زمانی قوڕەیشە.

**سێیەمیان:** ڕایان وایە کە هەر حەوتەکەی ماوەتەوە «واتا لە قورئاندا هەموو زاراوەکانی عەرەبی تێدایە، بەڵام هەرچەندە ئەم ڕایەیان ڕایەکی لاوازەو لە زۆر شوێندا بەکار نەهاتووە، بەڵکو ئەو زمانەی کە زۆرینەی قورئانی پیرۆزی پێ نووسراوەتەوەو پێ دابەزیوە، ئێستا ئێمە لە موسحەف ئەیخوێنینەوە زۆرینەی زمانی قوڕەیشە، واتا: ئەو زارە زاڵە بەسەر قورئاندا مەبەستیشمان لەوەی کە دەڵێین زاڵە لەسەر شێوەزاری قورئانە کە وشەکان موافیقی(هاوتاو هاوشێوەی) زاری قوڕەیشە.



## ٦٤ حیکمەت چییە لەوەی کە قورئانی پیرۆز بە حەوت شێواز دابەزیوە ؟

**و- یەکەمیان:** ئاسانکاری بۆ ئوممەت و ڕەحمەتی خودایە کە لە هەموو زاراوەکانی تێدا بێت بۆ ئەوەی عەرەب تێی بگات.

**دووەمیان:** بۆ بڵاوبوونەوەی دەعوەو بانگەوازی ئیسلام بۆ ئەوەی هەموو قەبائیلەکانی(هۆزەکان) عەرەب لێی تێبگەن؛ چونکە عەرەب ئوممەتێکی نەخوێندەواربوون.

**سێیەمیان:** کورتبڕیی، هەروەها ڕەوانبێژیی قورئان دەردەخات؛ چونکە جیاوازیی هەیە لە زارێك بۆ زارێکی دی قورئانیش موعجیزەیە(پەرجووە) بۆیە هەموو وشەکانی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە.

**چوارەمیان:** بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز سەرچاوەکەی سرووشی خوداییەو خودای گەورە خۆی ئاگادارەو زانایانە بەهەموو زارەکان بۆیە قورئان بە زاری کەس نەنوسراوەتەوە بەتایبەت، بەڵکو لەلایەن خودایەکەوە هاتووە کە خۆی زانایە بەهەموو زارەکانو بە هەموو زمانەکان.

**پێنجەمیان:** هۆکارێکە بۆ یەکگرتنی زمانی عەرەبی، وەك چۆن دەوترێت زمانی ستاندارد کە زۆرێك لە وڵاتەکان نیانە، تا ئێستا وەکو کورد زمانێکی ستانداردی دروست نەکردووە کە دەکرێ بکرایەو هەموو زارەکان کۆبکرێتەوە کام وشەیە جوانترە بەکاربهێنرێتو بکرێتە زمانێك کە هەموو خەڵك قسەو گفتوگۆی پێ بکەن لەگەڵ ئەوەشدا زمانەکەی خۆشیان دەمێنێت.

**شەشەمیان:** ئەم (الأحرف السبعة) یە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی ئوممەتی ئیسلام، هەروەها یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی قورئانی پیرۆز ..



## ٦٥ مەبەست چییە لە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز ؟

و- مەبەست لە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز دووجۆرە کۆکردنەوەمان هەیە:

کۆکردنەوەی یەکەمیان: کۆکردنەوەیەتی لە سینگی هاوەڵاندا پێش هەموو شتێ لەسینگی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە لەبەری کردووە(ئەزبەری کردووە) دواتر بەشێکی زۆریان لە سەحابە(هاوەڵان) قورئانیان لەبەربووە.

جۆری دووەمیان: مەبەستمان لە کۆکردنەوەی قورئان کۆکردنەوەیەتی بەمانای نووسینەوەو تۆمارکردنی لە کتێبێکدا کە موسحەفە، بەڵگەشمان چییە لەسەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز خودا پاراستوویەتی لە سینگی ئەهلی ئیمانو لە سینگی قورئان خوێنەکاندا ئەوەیە کە خودای گەورە دەفەرمووێت ( بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ) العنكبوت (٤٩



## ٦٦ بەڵگە چییە لەسەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز دابەزیوە بەحەوت پیت، یاخود بەحەوت شێوە ؟

و- زانایان لەسەر ئەوە کۆدەنگن کە قورئان بە تەواتور دابەزیوە لەسەر حەوت شێوە بەڵگەشمان بۆ ئەمە فەرموودەی ئیبن عەباسە (رضي الله عن) لە (بخاری و مسلم) دا کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (أقرأني جبريل على حرف فراجعتُهُ، فلم أَزَل أَستَزيدُهُ ويَزيدُني حتى انتهى

إلى سبعة أحرف) واتا: جبریل یەکەم جار بەیەك حەرف بۆی خوێندمەوە بەیەك زار دوایی داوام کرد بۆم زیاد بکات، تا حەوت پیت، واتا: تا حەوت شێواز بەم شێوەیە لە کۆتایدا جبریل بۆی خوێندمەوە، هەروەها حەدیثی»ام أیوب «کە ابن ابی عاصم ڕیوایەتی دەکات پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی ( أنزل القران على سبعة احرف أيها قرأت أصبت» «واتا: قورئان بەحەوت شێوە دابەزیوە بەهەر کامیان بیخوێنیتەوە ڕاستە، هەروەها لە فەرموودەیەکی تریشدا کە گفتوگۆی ئیمامی عومەرە لەگەڵ سەحابییەکدا (هاوەڵێکدا) فعن عمرَ بنِ الخطاب -رضي الله عنه- قال: ( سمعتُ هشامَ بنَ حكيمِ بنِ حِزامٍ يقرأ سورة الفرقان في حياة رسول الله (ﷺ)، فاستمعت لقراءته، فإذا هو يقرأ على حروف كثيرة لم يُقرئنيها رسول الله (ﷺ) فكدت أساوره في الصلاة، فتصبرت حتى سلَّم فلبَّبته بردائه، فقلت: من أقرأك هذه السورةَ التي سمعتك تقرأ؟، قال: أقرأنيها رسول الله (ﷺ)، فقلت: كَذَبْتَ، فإن رسول الله (ﷺ)، قد أقرأنيها على غير ما قرأت، فانطلقتُ به أقوده إلى رسول الله (ﷺ) فقلتُ: إني سمعت هذا يقرأ سورة الفرقان على حروف لم تُقرئنيها، فقال رسول الله (ﷺ): أرسله، اقرأ يا هشام، فقرأ عليه القراءة التي سمعتُه يقرأ، فقال رسول الله (ﷺ): كذلك أُنزلت، ثم قال: اقرأ يا عمر، فقرأتُ القراءة التي أقرأني، فقال رسول الله (ﷺ): كذلك أنزلت، إن هذا القرآن أُنزل على سبعة أحرف، فاقرؤوا ما تيسر منه) البخاري/٢٤١٩ ومسلم/٨١٨

واتە: ئیمامی عومەر (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لەگەڵ سەحابیەک (هاوەڵێك)دا کە هیشامی کوڕی حەکیمی کوڕی حیزامە، دەبێت بە گفتوگۆیان لەسەر ئەوەی کە هەریەکەیان بەشێوەیەك دەیخوێنێتەوە دوایی کە دەچنە لای پێغەمبەری خودا (ﷺ)ئەفەرمووێت

هەردووکتان ڕاست دەیخوێننەوە ئەم هاوەڵە بەشێوەیەك گوێی لێبووە لەپێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەویش بەشێوەیەکی دی، واتا: هەردووکیان قورئانی پیرۆزی پێ دابەزیوە .



## ٦٧ حوکمی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز چییە ؟

و- بۆ ئوممەتی ئیسلام واجبە(ئەرکە) کە قورئان لەبەر بکەن لە سنگیاندا، بەڵام بۆ ئەفرادی ئوممەت(تاکەکانی کۆمەڵگەی موسڵمان) ئەوەیە کە (مرۆڤ) کەمترین ئەوەی لەبەری بێت پێویستە ئەوانەی لەبەر بێت کە لە نوێژەکاندا بیخوێنێتەوە؛ چونکە نوێژ بێقورئان نابێت لەوانەش سورەتی»الفاتحة» هەروەها دوای سورەتی الفاتحة سورەتێکی تریش بخوێنێتەوە هیچ نەبێت دوو سورەتی لەبەربێت جگە لە الفاتحة بۆ ئەوەی نوێژەکەی پێ ڕەوان بکات ..



## ٦٨ ئایا قورئانی پیرۆز لەبەرکردن فەزڵی هەیە ؟

و- بەڵێ؛ چونکە پێغەمبەری خودا (ﷺ) (هاوەڵان)ی هانداوە بۆ لەبەرکردنی قورئانو ئەوانەی کە قورئانیان لەبەر بووە پێشی خستوون لە پێش نوێژییداو پێشی خستوون لە جیهادا پێشی خستوون لە شەهیدیا، کاتێك کە شەهید دەکران ئەوانەی قورئانیان زۆرتر لەبەربووە ئەوانەی پێش دەخست لە ناشتندا، هەروەها ئەو کەسەی قورئانی پیرۆزی لەبەربووبێت ژنی لێ مارەکردووەو مارەییەکەی بریتی بووە لە چەند سورەتێکی قورئانی پیرۆز کە لەبەری بووە ..



## ٦٩ چی ڕێگای بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئاسان کردووە کە قورئانی پیرۆز زوو لەبەربکات بەردەوام کە بۆی دەهات لەبەری دەکرد ؟

**و- یەکەمیان:** خودای گەورە خۆی بەڵێنی پێدابوو کە قورئانی بۆ لە سینگیدا کۆبکاتەوە (إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ)

**دووەمیان:** پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار بووە ئومییبووە، کەسێك کە ئوممیی بێت ئاسان شت لەبەر دەکات؛ چونکە مێشکی خۆی بەکاردەهێنیو پشت بەمێشکی خۆی دەبەستێت نەك بە پێنووسو تێنووس.

**سێیەمیان:** پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاتێك کە قورئانی پیرۆزی بۆ دادەبەزی یەکسەر (ڕاستەخۆ) دەیفەرموو بەوانەی کە نووسەری سرووش بوون بۆ ئەوەی بینووسنەوەو بیگەیەنن، لەبەرئەوەی خوێندنەوەی جارێکیترو نووسینەوەی لەڕێی لەبەرکردنەوە ئەمە بووە هۆی ئاسانکردنی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ).

**چوارەمیان:** دابەزینی قورئانی پیرۆز بە پارچە پارچە ، دوا بەدوای یەک ئەمەش بەهەمان شێوە ئاسانکاریی بوو بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە قورئان لەبەر بکات.

**پێنجەمیان:** خوێندنەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ قورئان شەوانەو شەونوێژکردنی، ئەمەش هۆکارێك بوو بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز.

**شەشەمیان:** هەروەها مودارەسەکردنی جبریل (علیه السلام) کە هەموو ڕەمەزانێك ئەهات بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) قورئانی پیرۆزی پێ خەتم ئەکرد، لەکۆتایی ساڵی تەمەنیشیدا دووجار قورئانی پێ خەتم کرد، ئەمانە هەمووی بەڵگەن لەسەر ئاسانکردنی قورئانو لەبەرکردنی بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) .



## ٧٠ بەناوبانگترین ئەو هاوەڵانە کێ بوون کە قورئانیان لەبەر بووە لە موهاجیرین (کۆچکردووان) ؟

**و-** لە موهاجیرین، یاخود لە کۆچەران، دووای چوار خولەفای ڕاشیدین بریتی بوون لەم هاوەڵە بەڕێزانە « طلحة، سعد، ابن مسعود ، حذیفە، سالم، ابی حذیفە، عبداللەی کوڕی عمر، عبداللەی کوڕی عباس، عەمری کوڕی عاصو عبداللەی کوڕی ، عبداللەی کوڕی زوبەیر، عائیشة، حەفصة، ئوم سەلەمە »» ئەمانە حوففاظی موهاجرین بوون (ئەو کەسانەبوون کە قوریانیان لەبەربووە لە کۆچەران) ..



## ٧١ ئەی بەناوبانگترین ئەو هاوەڵانەی کە لە ئەنسار قورئانیان لەبەر بوو کێ بوون ؟

**و-** لە ئەنساریش ئەوانەی قورئانیان لەبەر بووە بریتی بوون لەم هاوەڵە بەڕێزانە « عوبادەی کوڕی صامیت، ئوبەی کوڕی کەعب، موعاذی کوڕی جبل، زەیدی کوڕی ثابت، فوضالەي کوڕی عوبەید ، مەسلەمەی کوڕی مەخلد ، ئەبو دەرداء، ئەنەسی کوڕی مالیک، ئەبو زید بن سکن »» ئەمانە قورئانیان لەبەر بووە لە ئەنسار ..




## قورئانی پیرۆز چەند جار نووسراوەتەوە ؟

**و-** قورئانی پیرۆز سێ جار نووسراوەتەوە:

**یەکەمیان:** لە سەردەمی پێغەمبەری خودادا (ﷺ) نووسراوەتەوە لە پەڕاوەکانداو لە ئێسقانی(ئیسك) شان و لە پەلکە خورمادا.

**دووەمیان:** لەسەردەمی ئیمامی ابو بکر(رضي الله عنه) نووسراوەتەوە.

**سێیەمیان:** لە سەردەمی ئیمامی عثمانی کوڕی عفان (رضي الله عنه) نووسراوەتەوە .




## ئەو (هاوەڵانە) کێ بوون کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەڵیبژاردەبوون و نووسەری سرووش بوون؟

**و-** ئەم سەحابە بەڕێزانە چوار خولەفای ڕاشیدین کە نووسەری سرووش بوون بریتی بوون لەمانە « زیدی کوڕی ثابت ، ئوبەی کوڕی کەعب ، معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ، یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان ، زوبەیری کوڕی ئەلعوام ، عەمری کوڕی عاص ، موغیرەی کوڕی شوعبة ، عبداللّٰەی کوڕی رواحە ، خالیدی کوڕی وەلید» ...هتد ئەمانە نوسەری سرووش بوون بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) .



## شێوازی (کۆکردنەوەی) قورئـــانی پیرۆز چۆن بوو لە سەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ؟

**و-** پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاتێك کە ئایەتێك، یان چەند ئایەتێك دائەبەزی فەرمانی دەکرد کە بینووسنەوەو پێی دەگوتن لەکوێی دابنێن ئەم ئایەتەو لەکامە سورەت دادەنرێت؛ چونکە دانانی ئایەت‌و سورەتەکانی قورئانی پیرۆزو ڕیزکردنی ئایەتەکان لەهەر سورەتێکدا ئەمە کارێکی تەوقیفیەو لەلایەن پێغەمبەری خوداوە بووە (ﷺ) ..



## بۆچـــی لەسەردەمی پێغــەمبەری خودا (ﷺ) قورئـــانی پیرۆز نووسراوەتەوە ؟

**و- یەکەمیان:** بۆئەوەی کە پاڵپشتیەك بێت لەگەڵ لەبەرکردندا بۆ پاراستنی قورئـــــان بۆیە لەسەردەمی پێغـەمبەری خودا (ﷺ) هەم نووسراوەتەوە هەم لەبەریش کراوە بۆ ئەوەی بەهەردوو ڕێگاکە قورئانی پیرۆز پارێزراوبێت ،

**دووەمیان:** بۆ گەیاندنی سرووش بە باشترین شێوە؛ چونکە ناکرێت (مرۆڤ) تەنها پشت ببەستێت بە لەبەرکردن‌و ئەوە تەنها بەس نییە؛ چونکە هەموو کەسێك شایەنی ئەوەیە لەبیری بچێتەوە، بەڵام نووسین ئەمێنێتەوەو نافەوتێت .




## ئامرازەکانی نووسینەوە چی بووە لە سەردەمی سەحابەدا (هاوەڵان) ؟

**و-** (هاوەڵان) (رضی الله عنهم) لەسەر پارچە قوماش، یاخود لەسەر پارچە پێستەیەك یاخود لەسەر پەلکە خورماو لەسەر بەردی تەنکو لەسەر تەختەو ئێسقانی شانو ئەم شتانە قورئانیان دەنووسیەوەو دەیانپاراست ..




## بۆچی لە سەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ) قورئانی پیرۆز کۆنەکرایەوە نەکرا بە موسحەفێك ؟

**و- یەکەمیان:** سەحابە ئەمین (دەستپاك) بوون ؛ چونکە قورئانیش لەناو ناچێت، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) خۆی لەناو سەحابەدا بووە ئەویش سەرچاوەی سەرەکی (هاوەڵان) بووە، بەڵام بەپێچەوانەی دوای وەفاتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە ئەم زەمانە نەما.

**دووەمیان:** هێشتا سرووش کۆتایی پێ نەهاتووەو دەکرێت هەندێك لە ئەحکامەکانی قورئانی پیرۆز، یاخود هەندێك ئایەتەکان نەسخ بکرێنەوە.

**سێیەمیان:** قورئانی پیرۆزی خۆی پارچە پارچە دابەزیوەو پێش وەفاتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) قورئان تەواو بوو ئەویش ماوەی «٢٣»ساڵە ئایەتو ئایەت سورەت سورەت دادەبەزی بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ).

**چوارەمیان:** چونکە ڕێکخستنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو سورەتەکانی لە موسحەفدا لەسەر ڕیزبەندی دابەزینی نییە.

**پێنجەمیان:** هیچ پاڵنەرو هۆکارێك نەبووە پاڵنەربێت بۆ ئەوەی کە قورئان لە موسحەفێکدا جەمع بکرێت(کۆ بکرێتەوە).

**شەشەمیان:** چاوەڕێبوون کە تەواو بێت، چونکە قورئانیش چەند شەوێك پێش وەفاتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) سرووش تەواو بووە خەتم بووە (کۆتایی پێهاتووە)لای خودای پەروەردگارەوە ئیتر وەستاوە دابەزینی .




## هۆکاری کۆکردنەوەی قورئــانی پیرۆز چی بوو لەلایەن ئیمامی ئەبوبەکری سیدیقەوە (رضی الله عنه) ؟

**و-** هۆکارەکەی ئەوە بووە کە لە جەنگەکانی ڕیددەو هەڵگەڕانەوە لەئیسلامدا کۆمەڵێکی زۆر لەو سەحابانە شەهیدبوون کە قورئانیان لەبەربوو، ئیمامی عومەر(رضی الله عنه) (ڕاوێژی) کرد لەگەڵ ئیمامی ابو بکر دا (رضی الله عنه) پێشنیاری بۆ کرد کە قورئانی پیرۆز بنوسرێتەوە، نەکا ئەو سەحابانەی کە قورئانیان لەبەرە هەموویان شەهید بکرێن و قورئان لەناو بچێت ئەوە بوو ئیمامی عومەر زۆر لەگەڵ ئیمامی ئەبوبەکردا هەوڵیدا تا دڵی نەرم بوو ئەو کارەی کرد (رضی الله عنهم) .



## ٧٩ مێژووی کۆکردنەوەی قورئـــانی پیــرۆز لە سەردەمی ئیمــامی ئەبوبەکرا (رضی الله عنه) ئەگەڕێتەوە بۆ کەی ؟

**و ـ** ئەگەڕێتەوە بۆ دوای شەڕی یەمامە لەساڵی «١٢»ی کۆچیدا .



## ٨٠ هۆکاری هەڵبژاردنی ئیمامی ئەبوبەکر (رضی الله عنه) چی بوو بۆ «زیدی کوڕی ثابت» کە کردی بە ســەرپەرشتیاری پــڕۆژەی کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز ؟

**و ـ یەکەمیان:** چونکە یەکێك بوو لە حافزە گەورەکانی قورئان.

**دووەمیان:** خۆی ئامادە بووە چونکە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە کۆتایی ژیانیدا لە ڕەمەزاندا جبریل (علیه السلام) دووجار قورئانی پیرۆزی بۆ خوێندۆتەوە و ئاگای لێبووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) چی پێ وتوون ئامادەی دوا خوێندنەوەی قورئان بووە لەلایەن پێغەمبەری خوداوە (ﷺ).

**سێیەمیان:** زید یەکێك بووە لە نووسەرەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆ نووسینەوەی سرووش.

**چوارەمیان:** چونکە گەنج بووە و عاقڵو وریاو زیرەك بووە، ئەمیندار بووە، لە(سەردەمی) پێغەمبەری خودادا (ﷺ) بەچەند ڕۆژێك فێری زمانی یەهود(جووەکان) بووە بەم تەمەنە منداڵیەی رضی الله عنه .




## ئــایــا ڕێبـازی «زیدی کوڕی ثابت «رضی الله عنه چــی بوو لە کۆکردنەوەی قورئاندا ؟

و- ڕێبازی زیدی کوڕی ثابت لە کۆکردنەوەی قورئاندا لەسەر سێ تەوەرە بەند بووە ؛

**یەکەمیان:** مەرجی ئەوە بووە کە ئەبێت ئەوەی کە کۆی کردۆتەوە لەو موسحەفەیا لەسەردەمی پێغەمبەری خودایا ﷺ بەدەستی پێغەمبەری خودا ﷺ نووسرابێتەوە وە ئەوەبێت کە بۆ دواجار پێغەمبەری خودا ﷺ پێش وەفاتی بۆی خوێندۆتەوە.

**دووەم:** ئەبێت ئەوەی کە ئەنوسرێتەوە لە سینگی سەحابەیا پارێزراو بێت، واتە: لەبەریان بووبێت.

**سێیەم** : هیچ شتێکی وەرنەگرتووە هیچ لاپەڕەیەکی نەنووسیوە، تاوەکو دووکەس لە سەحابە شاهێدی بۆ نەدابێت کە ئەمە لەسەردەمی پێغەمبەری خودادا ﷺ لەبەردەستی پێغەمبەری خودادا ﷺ نووسراوەتەوە.

**"چوارەم:** لەکەسی قبوڵ نەکردووە کە بە لەبەر قورئانی خوێندبێتەوە بۆ ئەوەی بینووسنەوە (تەنها) ئەو کەسانە نەبێت کەخۆی لە دەمی پێغەمبەری خوداوە ﷺ بیستوویەتی، ئەم تەوەرە مەنهەجو ڕێبازی کۆکردنەوەی قورئان بووە لەلایەن زیدی کوڕی ثابتەوە بەفەرمانی خەلیفە ئەبوبەکری صدیق (رضی الله عنهما ) ..




## خاصیەتەکانی کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز چی بوون لە سەردەمی ئیمامی ئەبوبەکری (صدیق رضی الله عنه) ؟

**و- یەکەمیان:** بە وردترین شێوە لە گەڕانو پشکنینو وردەکارییو ڕەنگینیی کارەکە ئەنجامدراوە.

**دووەمیان:** ئەو ئایەتانەی کە نەسخ بۆتەوە لەڕووی خوێندنەوەو تیلاوة لە قورئاندا ئەوانە هەمووی لابراوەو فەرامۆشکراوە نەنووسراوەتەوە.

**سێیەمیان:** ئەوەی کە لە دواجاردا پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆی خوێندراوەتەوە لەلایەن جبریلەوە (علیه السلام) ئەویش بۆ سەحابەی خوێندۆتەوە لەسەر هەر حەوت زمانەکەی عەرەب واتا «الأحرف السبعة» ئەوە بە سەرچاوە وەرگیراوە.

**چوارەمیان:** ئەم کۆکردنەوەیەی ئیمامی ئەبوبەکر (رضی الله عنه ) بەڕیز بەپێی ئایەتەکانو سورەتەکان دانراوە وەکو ئێستا کە لەبەر دەستی ئێمەدایە.

**پێنجەمیان:** لەو پرۆژەیەی کۆکردنەوەی قورئانەدا تەنها یەك نوسخەی (چاپ-بەرگ) قورئانی پیرۆز کۆکراوەتەوەو نووسراوەتەوەو ئیمامی ئەبوبەکر (رضی الله عنه) خۆی پارێزگاری لێ کردووە لای خۆی دایناوە؛ چونکە ئەوکاتە پێشەوای موسڵمانان بووە دوای پێغەمبەری خودا (ﷺ)

**شەشەمیان:** ئەبوبەکری صدیق (رضی اللە عنە) خەڵکی ئیلزام (ناچار) نەکردووە کە ئەبێت هەمووتان بەپێ ئەو موسحەفە بخوێننەوە لە سەردەمی خۆیدا.

**حەوتەمیان:** ئەو کتێبە ناونرا موسحەف کە (کۆکردنەوەی) هەموو قورئان بوو کە یەکەمجار ئەم وشەیە بەکارهات لە (سەردەمی) ئیمامی ئەبوبەکری صدیقدا (رضی اللە عنە) پێشتر تەنها صوحوف هەبوو لە پەڕەدا هەر پەڕەیەك لای سەحابیەك بووە ئەوە نەبووە کۆکرابێتەوە لەیەك کتێبدا، بەڵکو لەسەردەمی ئەبوبەکری صدیقدا کە ناونرا موسحەف ئەوکاتە هەموو قورئانی پیرۆز لە سورەتی « الفاتحة وە بۆ الناس «لەنێو یەك کتێبدا کۆکرایەوە کە پێ وترا «المصحف ”



## ٨٣ پێگەی کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆزی ئیمامی ئەبوبەکری (رضی اللە عنە) چی بوو لای سەحابە ؟

**و-** سەحابە لەسەر ئەوە کۆکن زۆر بەوردیی‌و زۆر بەجوانیی‌و بەبێ زیادو کەم قورئان لە (سەردەمی) پێشەوا ئەبوبەکری صدیق کۆکراوەتەوەو هەموویان لەسەری ڕازیبوون‌و هیچ سەحابیەك پێچەوانەی ئەو کۆکردنەوەیە نەبووە .



## ٨٤ ئەو موسحەفەی کە کۆکراوەی هەموو قورئـانی پیــرۆزە چی لێهات دوای ئەوەی کە تەواو بوو ؟

**و-** دوای ئەوەی کە «زیدی کوڕی ثابت» پڕۆژەکەی تەواوکردو قورئانەکەی تەسلیم کرد بە ئیمامی ابو بکری صدیق (رضی اللە عنە)

کە هەمووی کۆکردەوە لە دووتۆی موسحەفێکدا، دوای وەفاتی ابو بکری صدیق ئەو کتێبە گوازرایەوە بۆلای پێشەوا ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) کە ئەو کاتە ئەو بوو بەپێشەوای باوڕداران دوای شەهید بوونی ئیمامی عومەریش (رضی الله عنه) ئەم قورئانە کەوتە لای»حفصەی» کچی ئەویش بە وەسیەتی ئیمامی عومەر؛ چونکە کە ئیمامی عومەر وەفاتی کرد هێشتا کەس نەکرابوو بەخەلیفەو کەس دانەنرابوو بۆیە داوای کرد بەشورا خۆیان لەو چەند کەسەی دیاری کردبوو یەکێك هەڵبژێرن بۆیە، وەسیەتی کرد کە ئەو قورئانە لای حەفصە بێتو حەفصەش خێزانی پێغەمبەری خودابوو (ﷺ)و خودای گەورە شاهێدی بۆ ئەدات کە «صوامة و قوامة»یـە واتا کەسێکە کە زۆر بەڕۆژو بووەو زۆر شەونوێژی کردووەو زۆریش مەشهور بووە بە حافیزەی قورئان خاوەن عیبادەتو تەقوای زۆربووە، دوای ئەم وەسیەتەی ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) کە وەسیەتی کرد لای ئەو موسحەفەکە دابنێن پێ وتراوە «حاریسەی قورئان پاسەوانی قورئان» دوای ئەوەش سەحابە حەزیان نەکردووە وەسیەتەکەی ئیمامی عومەر هەڵوەشێننەوە هەر لای ئەو ماوەتەوە تا سەردەمی ئیمامی عثمان (رضی الله عنه) کە داوای لێکرد بیداتێ بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بۆ ئەوەی لەسەری بنووسێتەوە بۆیە کاتێك کە جیاوازی دروست بوو لەنێوان خوێندنەوەی قورئاندا ئیمامی عثمان رضی الله عنه موصحەفەکەی وەرگرت لە حفصە نوسخەیەکی لەسەر نووسیەوە پاشان بۆی گێڕایەوە، لەدوای وەفاتی حفصەش (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێبێت )مەڕوانی کوڕی حەکەم کە ئەو کاتە شازادەو میر بووە لە مەدینەدا داوای کرد کە ئەم موصحەفە بدرێت بە براکەی «عبداللەی کوڕی عومەر «و

دیارە حیکمەتیشی تێدابووە هەرچەندە زانایان ئەوەندە ئەڵێن ئەمە بە وەسیەتی ئیمامی عومەر بووە (رضی الله عنه) ئیمامی عومەریش کەسێکی خاوەن ئیلهامەو لەلایەن خودای پەروەردگارەوە ئیلهامی بۆ هاتووەو قسەکانیشی هەمووی جێی تەوفیقو حیکمەتی خودایی بووە کە ئەم قورئانە لەدوای ئیمامی ابو بکرو عومەر (رضی الله عنهما) کە ئەو دوو کەسەن کە باشترینی هەموو سەحابەن‌و وەزیری پێغەمبەری خودا بوون (ﷺ) ئەم قورئانە ئەکەوێتە لای ئافرەتێك هەتا دەمرێت لای ئەو دائەنرێت لە کاتێکدا ئەم کتێبە گەورەترین و پیرۆزترین کتێبە لای موسڵمانان‌و ئافرەت لەو سەردەمەدا لە هیچ شوێنێك ڕێزی لێ نەگیراوەو بەسووك سەیرکراوە بەڵام لای موسڵمانان کرا بە پاسەوانی قورئان‌و لەنێو هەموو سەحابەیا ئافرەتێك کراوە بە پاسەوانی قورئانی پیرۆز هەڵبەتە ئەمەش حیکمەتێکی ئیلاهیە کە ئەیسەلمێنی ئیسلام چەندە ڕێزی لە ئافرەت گرتووەو ئیسلام چەندە گەورەیە ئەگەر ئەو شکۆو گەورەیەی خۆی بپارێزێت بۆیە دووژمنان هەمیشە ویستوویانە لەو شکۆو گەورەیەی ئافرەت بدەن‌و ئافرەت بچووك بکەنەوە بەڵام ئەمان پێیان خۆش نەبووە ئەم موسحەفەی لێ وەربگرنەوە تا مردیش هەر لای ئەو بوو دوایی کە مردیش داواکرا بدرێت بە «عبداللەی کوڕی عومەر» بۆیە درا بەو ، پاشانیش ابن عومەر ئەم موسحەفەی نارد بۆ لای «مەڕوانی کوڕی حەکەم «بەڵام مەڕوانی کوڕی حەکەم لەوە ترسا خیلافێك هەبێت لەنێوان ئەو موسحەفەو موسحەفی عثمانیدا بۆیە نەسخی کرد لەسەری‌و ناردی بۆ هەموو شارەکان‌و هەموو ناوچەکان‌و ئەو نوسخەیەی لەناوبرد بۆ ئەوەی نەبێتە دوو نوسخە، نەکا جیاوازییەك هەبێت لە نووسین‌و ڕێنووسدا، لەبەر ئەوە تەنها ئەو

ڕەسمە عثمانییە مایەوە بۆ هەتا هەتا كە ئێستا هەمووومان لەسەر ئەو ڕەسمە ئەڕۆین پێ ئەوترێت ڕەسمی «عثمانی» واتا شێوازی نووسینی ئیمامی عثمان (رضی الله عنه).



## ٨٥ بۆچی ئیمـامی عثمان (رضی الله عنه) هەڵسا بەكۆكردنـــەوەی قورئانی پیرۆز دووبارە ؟

وـ هۆكارەكەی ئەوە بوو كە حوزیفەی كوڕی یەمان (رضی الله عنه) ئەمینداری نهێنییو ڕاستگریی پێغەمبەری خودابوو (ﷺ) هات بۆ لای ئیمامی عثمان (رضی الله عنه) دوای ئەوەی كە لەگەڵ ئەهلی شامدا بووە لە فتحی ئەرمینیاو ئازربایجانو لەگەڵ ئەهلی عێراقدا بووە سەیری كرد زۆر جیاوازی هەیە لە خوێندنەوەی قورئاندا زۆر ترسا بەشێوەیەك خەریكبوو خەڵكی یەكتری كافر بكەن؛ چونكە سەیریان كرد جیاوازی زۆرە لە خوێندنەوەی قورئاندا بۆیە داوای كرد لە ئیمامی عثمان فەرمووی فریای ئەم ئوممەتە بكەوە پێش ئەوەی ناكۆك بن لە قورئاندا، وەكو چۆن جولەكەو گاور لە كتێبەكانی خۆیاندا ناكۆك بوون بۆیە ئیمامی عثمان (رضی الله عنه) هەڵسا بەم كارە.



## ٨٦ مێژووی كۆكردنەوەی قورئانی لە زەمەنی ئیمامی عثماندا (رضی الله عنه)كەی بوو ؟

وـ مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ كۆتایی ساڵی «٢٤»ی كۆچیو سەرەتای «٢٥»ی كۆچی كە ئیمامی عثمان (رضی الله عنه) هەڵسا بەم پڕۆژەیە.




## ئەندامانی ئەو لیژنەی کێ بوون کە ئیمامی عثـمــان (رضی الله عنە) هەڵیبژاردن بۆ ئەم کارە ؟

و- ئیمامی عثمان (رضی الله عنه) چوار کەسی هەڵبژارد بۆ دووبارە نووسینەوەی موسحەف‌و ناردنی بۆ هەموو شارەکان ئەوانیش بریتی بوون لە» زەیدی کوڕی ثابتی ئەنصاری ، عبداللەی کوڕی زوبەیر، سەعیدی کوڕی عاص ، عبدالرحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشام « ئەم سیانە جگە لە زید لە قوڕیشن و شارەزای زمانی قوڕیشن زەیدیش زۆر شارەزای قورئان بووە بۆیە ئیمامی ابو بکریش (رضی الله عنه) ئەوی کرد بە سەرپەرشتیاری قورئان لە زەمەنی خۆیدا .




## شێوازی کۆکردنــەوەی قورئـانی پیرۆز چۆن بووە لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا (رضی الله عنە) ؟

و- دوای ئەوەی کە ئیمامی عثمان (رضی الله عنه) لەگەڵ سەحابەدا ڕێککەوتن، هەروەها هەموو سەحابە شاهێدی ئەدەن لەوانە ئیمامی علی (رضی الله عنه) خۆشی شاهێدە لەسەر ئەوە کە ئەم کارەی ئیمامی عثمان بە ڕازیبوونی هەموو سەحابە کراوە و کۆدەنگی (ئیجماع) ی هەموو سەحابەی لەسەر بووەو ڕازیبوون بەوەی کە قورئان بنووسرێتەوە لەسەر یەك حەرف‌و بەیەك زمان‌و جیاوازی زارەکانی تێدا نەمێنێت دوای ئەوەی کە ڕێککەوتن ئیمامی عثمان ناردی بەشوێن حەفصەی کچی ئیمامی عومەر (رضی الله عنهما) کە ئەم موسحەفەی

بۆ بنێرێت ئەویش موسحەفەکەی بۆ نارد ئیمامی عثمانیش (رضی الله عنە) تەسلیمی کرد بە لیژنەکە.

سەرنج بدەن ئیسلام چەند بە شێوەیەکی زانستیانە بەلیژنە ئەم کارەی کردووەو ئەوان ئەو موسحەفەی حفصەیان کرد بە سەرچاوەی سەرەکیی، پاشان لەوەوە لیژنەکە دەستی کرد بە لەبەر گرتنەوە (نەسخکردنی) ئەو قورئانانە بەو شێوەیەی کە داوای لێکردن ئەگەر ئێوە ئەو سێ کەسە لەگەڵ زیدی کوڕی ثابت ناکۆك بوون بەزمانی قوڕیش بینووسن؛ چونکە بەزمانی ئەوان دابەزیوە ئەمەش مەنهەجی ئیمامی عثمان بووە (رضی الله عنە) ئەوان لەسەر ئەوە ڕۆیشتوونو ئەگەر لە ئایەتێکدا چەند ڕیوایەتێك موتەواتیر بوو بەشێوەیەك ئەینووسن کەوای لێ بێت شێوازی نووسینەکە بۆ هەموویان بشێت بۆیە ئەبینین ئەو وشانەی کە جێی خیلافە چەند قیرائەتێکی تێدایە بۆیە وانووسراوەتەوە لە ڕەسمی عوسمانیدا کە بۆ هەموو قیرائەتەکان بشێت واتە: بۆ هەموو شێوازە خوێندنەوەکان، بەڵام ئەگەر نەکرا ئەم کارە لەیەك وشەدا، وەکو چۆن وشەی (فتبينوا)مان هەیە لەگەڵ وشەی (فتثبتوا)ئەبینین هەردووکیان ئەبێت؛ چونکە نوقتەی نەبووەو بەهەمان شێوە ئەبینین هەردووکیان حەوت پیتن ( فتثبتوا ، فتبينوا )و دەتوانرێت بۆ هەردووکیان بشێت، بەڵام ئەگەر نەکرا وشەیەك بەشێوازێك بنووسرێتەوە کە بۆ هەموویان نەشێت قیرائەتەکان هەمووی موتەواتیربێت ئەوکاتە لەهەندێك لە موسحەفەکاندا بەو شێوازە ئەنوسرێتو لە موسحەفێکی تردا بەم شێوەیە ئەنووسرێت بۆنموونە ئایەتی (١٣٣)ی «ال عمران»( وَسَارِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ) ،دەبینین لەهەندێك شوێن (وسارعوا) لەهەندێك شوێنیش ( سارعوا ) بەبێ «واو»ە کە بۆیە لەهەندێك لە موصحەفەکانیش کە

نوسراوە واوی لەگەڵدایە لەهەندێکی واوی لەگەڵدانیە کە هەردووکیان هاتووە بە واوو بەبێ واو ، ناشکرێت یەکێکیان لەجیاتی ئەویتریان؛ چونکە یەکێکیان واوی موتەواتیرە لە ڕەسمی عثمانیدا بەم شێوەیە جێ کراوەتەوە .



## ٨٩ خاسیەتەکانی کۆکردنەوەی قورئـــانی پیرۆز چـــۆن بووە لـــە سەردەمی ئیمامی عثمان (رضی الله عنه) ؟

**وـ یەکەمیان:** قورئان نووسراوەتەوە لەسەر یەك پیت، واتا: لەسەر یەك زار لەحەوت حەرفەکە ئەویش شێوە زاری قوڕیشە هەروەها ئەو شێوە زارانەی تریش کە هاوشێوەی زمانی قوڕیشە واتە: زمانی قوڕەیش کراوە بەئەسڵ (بنچینە) لە جەمعی (کۆکردنەوەی) ئیمامی عثماندا (رضی الله عنه).

**دووەمیان:** هەروەها وەکوکۆکردنەوەکەی ابو بکر (رضی الله عنه) ئەوەی کە تیلاوەکەی مەنسوخ بووە ئەوانەش نەنووسراوەتەوەو فەرامۆشکراوە.

**سێیەمیان:** بەهەمان شێوە ئەوەیان (چەسپاو و جێگیر) کردووەو نووسیوەتەوە کە دواجار جبریل(علیه السلام) بۆ پێغەمبەری خودای (ﷺ) خوێندۆتەوەو جگە لەدوا خوێندنەوە ئەوانیتریش فەرامۆشکراوە.

**چوارەمیان:** تەنها ئەو قیرائەتانە دانراوەتەوە کە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) (چەسپاوو جێگیر)ەو ئەوەی کە ثابت نەبووە لە موسحەفی عثماندا فەرامۆشکراوەو دانەنراوە.

**پێنجەمیان:** بەهەمان شێوە موسحەفی ئیمامی عثمانیش (رضی الله عنه) لەسەر هەمان شێوازی موصحەفی ئیمامی ابوبکر رضی الله عنهما بەڕیز سورەتەکان وئایەتەکان ڕیزکراوە، بەم شێوەیەی کە ئێستا کە لەبەر دەستماندایە .




**هەڵوێستی هاوەڵانی پێغەمبەری خـودا (ﷺ) چی بووە لەسەر ئەم کارەی ئیمامی عثمان (رضی الله عنه) ؟**

**و-** ئیمامی عثمان (رضی الله عنه) فەرمانی کرد جگە لەو چەند موسحەفەی کە نووسیەوە ئەوانیتر هەمووی بسووتێنن‌و فەرمووی ئەوەی لای من نییە، واتا: هاوشێوەی ئەم موسحەفانە نییە هەمووی لابەرن‌و سەحابەش هەمووی ڕازیبوون لەسەر ئەوە هەموو ئەیانوت کارێکی باشی کردووە عثمان و هیچ کام لە سەحابە دژی ئەم کارەی ئیمامی عثمان نەبوون‌و بوو بەهۆی ئەوەی ئەو فیتنە ئیختیلافیە لەنێوانان موسڵماناندا بکوژێنێتەوەو نەهێلی پەرەبەسەنێت ..




**ژمارەی ئەو موسحەفانە چەند بوون کە ئیمامی عثمـان (رضی الله عنه) فەرمانی کرد بە نووسینەوەو ناردنی بۆ ناوچەکان ؟**

**و-** یەکەمیان جیاوازی هەیە هەندێك ئەڵێن چوار نوسخەی ناردووەو زۆربەی زانایانیش لەسەر ئەوەن کە چوار نوسخەی ناردووە؛ یەکێ بۆ کوفە، یەکێ بۆ بەصرە، یەکێ بۆ شام ، دانەیەکیش لە مەدینە ماوەتەوە، دواتریش لەسەر ئەم چوار نوسخەیە نووسراوەتەوە.

ڕای سێیەمیشیان ئەڵێت: پێنج نوسخەی نووسیوەتەوەو ئەمەش ڕایەكی بەناوبانگە، ئیمامی سیوطی ئەفەرمووێت: دانەیەك بۆ كوفە، دانەیەك بۆ بەصرە، دانەیەك بۆ شام، دانەیەك بۆ مەككە، دانەیەكیش بۆ مەدینە.

ڕای چوارەمیشیان ئەڵێت: حەوت نوسخەی نووسیوەتەوە ، دانەیەك بۆ مەككە، دانەیەك بۆ شام دانەیەك بۆ یەمەن، دانەیەك بۆ بەحرەین، دانەیەك بۆ بەصرە، دانەیەك بۆ كوفە، دانەیەكیشی هێشتۆتەوە بۆ مەدینە ..



## ٩٢ جیاوازی نێوان كۆكردنەوەی ئیمامی ابو بكرو ئیمامی عثمان چی بوو (رضی الله عنهما) ؟

**و - یەكەمیان:** هۆكاری كۆكردنەوەی قورئانی پیرۆز لەلایەن ئیمامی ابو بكری صدیقەوە (رضی الله عنه) ترسان بووە لە لەناوچوونی قورئانی پیرۆز بەهۆی لەناوچوونی ئەو كەسانەی قورئانیان لەبەربووە، چونكە لە شەڕی یەمامەدا ژمارەیەكی زۆر لەو كەسانە شەهید كران كە حافزی قورئان بوون، بەڵام هۆكاری كۆكردنەوە لەسەردەمی ئیمامی عثماندا (رضی الله عنە) ترس بووە لە ناكۆكیو لە جیاوازی لە ڕووەكانی خوێندنەوەی قورئاندا،

**دووەمیان:** كۆكردنەوەكەی ئیمامی ابو بكر رضی الله عنه بریتی بوو لە هەموو ئەو حرفانەی كە لە كۆتا خوێندنەوەی قورئاندا بەكارهاتووە، بەڵام جەمعكردنەكەی لە (سەردەمی) ئیمامی عثماندا (رضی الله عنە) بریتی بوو لە كۆكردنەوەی لەسەر یەك زمانو یەك زار كە زاری

قورەیشە لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەك نووسراوەتەوە كە زارەكانی تریش جێی بێتەوە، بەڵام ئەوە كرا بە ئەسڵ (بنچینە) لەكارەدا.

**سێیەمیان:** ئیمامی ابو بكر رضی الله عنە لە سەردەمی خۆیدا خەڵكی پێوە پیوەست نەكرد بەزۆر كە بڵێت ئەبێت هەمووتان ئەم موسحەفە پەیڕەو بكەن، بەڵام ئیمامی عثمان (رضی الله عنە) بە ڕاپرسیو ئیجماعی سەحابە هەمووی مولزەم كردن كە دەبێت ئەم موسحەفە پەیڕەو بكەن ئەو موسحەفەی ئەو ناردوویەتی بۆ ناوچەكان.

**چوارەمیان:** كۆكردنەوەی سەردەمی ئیمامی ابو بكر (رضی الله عنە) بریتی بوو لە كۆكردنەوەی قورئان لەیەك كتێبدا، لەیەك موسحەفدا، بەڵام لە سەردەمی ئیمامی عثماندا (رضی الله عنە) لە دووبارە نووسینەوەی زیاتر لەچەند موسحەفێكو ناردنی بۆ ناوچەكان ..




## پێناسەی سورەت چییە ؟

**و-** سورەت لە زمانی عەرەبیدا»واتا پلەی بەرز، یاخود ڕێزو شكۆ، هەروەها بەواتای دیواری بەرزیش دێت ، بەڵام لە زاراوەی زانستی قورئاندا «بریتیە لە كۆمەڵێكی سەربەخۆی پێكهاتوو لە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز كە سەرەتاو كۆتای هەیە، بۆ نموونە وەك (الناس) سەرەتای هەیەو كۆتایی هەیە یاخود سورەتی (البقرة) سەرەتایی هەیەو كۆتایی هەیەو پێی ئەڵێن سورەت كە ناوە بۆ كۆمەڵێك ئایەت لە دووتۆی سورەتەكەدا كۆبوونەتەوە كە سەرەتاو كۆتاییەكەی دیاریكراوە .



## ٩٤ چۆن ئەو سورەتانە دەناسین ؟

وـ ناسینی ئەو سورەتانەی قورئانی پیرۆز بەوەی کە بزانین سەرەتاکەی لەکوێ دەست پێ دەکات‌و کۆتاییەکەی ئەمە شتێکی تەوقیفیە واتا: لەلایەن پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کراوە بەهیچ شێوەیەکیش ئیجتیهاد نییەو شتێکی دیاریکراوە هەموو کەسێك دەزانێت لە کوێوە دەست پێ دەکات‌و لە کوێوە کۆتایی پێ دێت .



## ٩٥ ژمارەی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز چەندە ؟

وـ بە ئیتیفاق «١١٤»سورەتەو هەروەکو لە موسحەفی عثمانیدا هەیە یەکەم سورەتمان سورەتی (الفاتحة) یـە کۆتا سورەتیش سورەتی (الناس)ە .



## ٩٦ سـورەتەکانی قورئـانی پیرۆز ئەکرێن بەچـەند بەشـەوە لە ڕووی ناوەوە ؟

وـ سورەتەکانی قورئانی پیرۆز ئەکرێن بەسێ بەشەوە بەشێکیان کە یەك ناویان هەیە بۆ نموونە وەکو،سورەتی ( النساء ـ الأعراف ـ الأنعام) هەروەها سورەتی تریشمان هەیە کە تەنیا یەك ناوییان هەیە.

جۆری دووەمیان ئەو سورەتانەی کە زیاد لەناوێکیان هەیە یاخود ئەو سورەتانەی کە دوو ناو یان سێ ناوییان هەیە بۆ نموونە وەکو،

سورەتی (النحل) کە پێی ئەوترێت «النعیم»سورەتی (المائدة) کە پێی ئەوترێت «العقود» یاخود هەیە سێ ناوی هەیە وەکو سورەتی (التوبة) کەپێی ئەوترێت» براءە ـ الفاضحة ـ...» یاخود سورەتی (الاسراء) کە پێی ئەوترێت سورەتی «بني إسرائیل (غافر ـ مؤمن)

جۆری سێیەمیان ئەو سورەتانەن کە بەدوو سورەت، یاخود سێ سورەت ناوێکیان هەیە بۆ نموونە سورەتی (البقرة) کەپێی ئەوترێت «الزهراوین» یان سورەتی (الناس، الفلق) کە پێی ئەوترێت «المعوذتان» یاخود سورەتی (الکافرون ، الإخلاص) کە پێیان دەوترێت سورەتەکانی»الإخلاص» سورەتی (الکافرون) یش دەخرێتە پاڵ سورەتی الإخلاص؛ چونکە هەردووکیان ئیخڵاصی تێدایە بۆ خودای پەروەردگار سورەتی الإخلاص ئیخڵاصی تەوحیدە سورەتی الکافرون بەرائەتە لە شیرك و کوفر ئەویش لە داواکارییەکانی تەوحیدە.



## ٩٧ سورەتەکانی قورئـــانی پیرۆز دەکرێن بەچەند بەشەوە لەڕووی کورتیی و درێژییەوە ؟

**وـ** سورەتەکانی قورئانی پیرۆز لەڕووی کورتیی و درێژییەوە ئەکرێت بەچوار بەش:

**یەکەم:** بەشێکیان پێ ئەوترێت «الطوال» کە ئەمەیان پێ ئەوترێت»السبعة الطوال» واتا سورەتە درێژەکان، یان حەوت سورەتە درێژەکە وەك سورەتەکانی ( البقرة ـ آل عمران ـ النساء ـ المائدة ـ الأنعام ـ الأعراف ـ الأنفال ـ التوبة ) و سورەتی «الأنفال ،التوبة « هەردووکیان حیسابی یەك سورەتیان بۆ ئەکرێت و زۆریش لە سەحابە ئەڵێن یەك سورەتە،

چونكە لە نێوانیاندا ( بسم الله )نییە ئەم حەوت سورەتە پێیان دەوترێت حەوت سورەتە درێژەكە.

**دووەم:** پێیان دەوترێت»المئون» ئەوانەی كە لە سەد بۆ سەرەوەن، ئەو سورەتانەن كە دوای حەوت سورەتە درێژەكە دێن لە سورەتی ( یونس ) تاوەكو ( السجدة ) ئەمانە پێیان ئەوترێت «المئون» یان ئەم سورەتانەی كە نزیكن لە سەد یان لەسەد زیاترن.

**سێیەم:** پێیان دەوترێت «المثاني» ئەوانەن كە لە خوار سەد ئایەتەوەن ئەوانیش دەست پێ دەكات لە سورەتی ( الأحزاب) تاوەكو (الحجرات) بۆیە پێی ئەوترێت «المثاني»چونكە زۆر ئەخوێندرێتەوە لە نوێژاو كورتترە لەوانەی كە سەد ئایەتن.

**چوارەم:** پێیان دەوترێت «المفصل» ئەوانیش ئەو سورەتانەن كە دوایی المثاني دێن لە سورەتی (القصص ) تاوەكو كۆتایی قورئان، بۆیە پێیان دەوترێت مفصل، چونكە لە نێوانیاندا فصل زۆرە (بسم الله) زۆرە. جیاوازی هەیە لە كوێوە دەست پێ ئەكات، بەڵام ڕای زۆربەی زانایان ئەوەیە كە لە سورەتی (ق)وە دەست پێ ئەكات هەتاوەكو كۆتایی سورەتی( الناس) پێیان دەوترێت (المفصل) هەرچەندە لەناو (مفصل) یشدا چەند بەشێك هەیە .


٩٨

## بەشەکانی (المفصل) چەندە ؟

**و-** مفصل کە باسمان کردو گوتمان دەست پێ دەکات لە سورەتی( ق ) تاوەکو کۆتایی، دەکرێت بەسێ بەشەوە.

**یەکەمیان:** «طوال المفصل» مان هەیە واتا ئەوانەی کە درێژن لە مفصلەکان لە سورەتی ( ق ) تاوەکوو (النبأ) پێی ئەوترێت»طوال“

**دووەمیان:** « أوساط المفصل» مان هەیە (أوساط المفصل) یش واتا ئەوانەن کە مام ناوەندن لە سورەتی (النبأ) تاوەکو سورەتی (الضحی).

**سێیەمیان:** « قصار المفصل » سورەتە کورتەکانن ئەویش دەست پێ دەکات لە سورەتی (الضحی) تاوەکو سورەتی (الناس).


٩٩

## ڕای زانایان چییە لەسەر ڕێکخستنی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز؟ هەڵوێستی ئێمە چی بێت سەبارەت بە (ڕێکخستن و ڕیزکردنی سورەتەکانی)ی قورئانی پیرۆز ؟

**و-** زانایان دوو ڕایان هەیە لەسەر ڕێکخستنی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز:

**یەکەمیان:** ڕایان وایە کەڕێکخستنی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز کارێکی تەوقیفیە لەلایەن پێغەمبەری خوداوەبووە (ﷺ) بەڵگەشیان بۆ ئەمە ئیجماعی سەحابەیە لەسەر ئەم تەرتیبە لە موصحەفی عوثماندا، هەروەها بەڵگەی دووەمیشیان ئەم فەرموودەیەی» ابو داود» ە ڕەحمەتی

خودای لێ بێت کە «ئەوسی کوڕی ابی ئەوسی سەقەفی» دەفەرمووێت پرسیارمان لەهاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کرد: لە ئێوە چۆن قورئانتان بەش دەکردو دەتان کرد بەئەحزاب؟ دەفەرموون ئێمە بەشمان دەکرد بە سێ سورەت و پێنج سورەت و حەوت سورەت و نۆ سورەت، یانزدە سورەت، سیانزدە سورەت، حیزبی مفصل دەست پێ ئەکات بە( ق ) تا کۆتایی قورئان، کەواتە لەلایەن پێغەمبەری خوداوە بووە (ﷺ) ئەم فەرموودەیەش جگە لە ابو داود ئیمامی احمدیش دەیگێڕێتەوە ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێت.

**ڕای دووەمیش:** دەڵێن ڕیزبەندیی و ڕێکخستنی سورەتەکانی قورئان، کارێکی ئیجتیهادی بووە لە لەلایەن هاوەڵانەوەو هاوەڵان خۆیان بە ئیجتیهادی خۆیان کردوویانە، بەڵگەشیان بۆ ئەمە ئەوەیە کە تەرتیبی قورئان لە موسحەفەکاندا جیاوازی هەیەو ئەگەر ئەم کارە تەوقیفی بوایە لای خودای پەروەردگارەوە ئەم جیاوازییە دروست نە دەبوو، بەڵگەی دووەمیشیان ئەم فەرموودەیەی ئیمامی (مسلم) ە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) سورەتی (البقرة) ی خوێندۆتەوە دوایی (النساء) دواتر (آل عمران) کە لەوێدا ئەبینین سورەتی (النساء) پێش سورەتی (آل عمران) کەوتووە کەواتە بەم شێوەیەش بێت ئەبێت، بەڵام ڕای یەکەم ڕای زۆربەی زانایانەو هەر ڕایەکیشیان دروست بێت سەبارەت بە ڕیزکردنی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز کە ئایا بەفەرمانی پێغەمبەری خودابێت (ﷺ) یان بە ئیجتیهادی هاوەڵان بێت و لە کۆتاییدا لەسەری ئیجماعیان کردبێت، ئێستا بەو شێوەیەیە کە لە موصحەفی عثماندایە، کەواتە پێویستە ئێمە لەسەر ئەو شێوازە بڕۆین و بەهیچ شێوەیەك گوێ لەو کەسانە نەگرین کە دەڵێن پێویستە جارێکی تر قورئان بەپێی

دابەزين ڕيزبكرێتەوە. نەخێر، بەڵكو ئێمە بەردەوام دەبين لەسەر ئەو شێوازەی كە هاوەڵان لەسەری هاوڕابوون.



## ١٠٠ ئايەت ماناى چييە لەزمان‌و لە زاراوەدا ؟

**و-** لە «زماندا ئايەت ماناى زۆرە لەوانە دەوترێت ئايەت ماناى موعجيزەو نيشانەيە، يان پەندو ئامۆژگارييە، يان بەڵگەيە، ياخود كارێكى سەيرە ئايەتێكە كە جێى سەرسوڕمانە، ماناكانى ئايەتيش واتا: جماعەت كۆمەڵێك.

بەڵام لە» زاراوەكانى قورئاندا ئايەت بريتيە لە چەند وشەيەك كە لە دەستپێك و چەند بڕگەيەک پێک هاتووەو ئەو بڕگانەش سورەتەكانى قورئان پێكدەهێنن، واتە بڕگەيەكن لە سورەتەكانى قورئانى پيرۆز .



## ١٠١ ژمارەی ئايەتەكانى قورئـــانى پيرۆز چـــەندە ؟

**و-** هەموو زانايان لەسەر ئەوە كۆدەنگن كە ژمارەی ئايەتەكانى قورئانى پيرۆز لە «٦٢٠٠» كەمترنيە بەڵام جياوازى هەيە لە دواى ئەم دووسەدەوە هەندێك ئەڵێن «٦٢٠٤» هەندێك دەڵێن «٦٢١٤»يە هەندێك دەڵێن «٦٢١٧» هەندێك دەڵێن «٦٢١٩» هەندێكى تر دەڵێن «٦٢٢٥ » هەندێكيش دەڵێن «٦٢٣٦» بەڵام ئەمەی كۆتايى لەبەركردنى ئاسانە؛ چونكە ئەبينين ئەگەر دوو شەش بنووسى لە ناوەڕاستيشيان سێ كە ژمارەی ساڵانى نبوەتى پێغەمبەرى خودايە (ﷺ) كە سيانزدە ساڵ لە مەككەو دەساڵ لە مەدينەيە كە دەكاتە بيست وسێ دواتريش شەشێكى تر بنووسە ئەمە ژمارەی ئايەتەكانى قورئانى پيرۆزە .

# نـــــاوەڕۆك

١- پێناسەی زانستەکانی قورئان چییە؟ مەبەستمان لە زانستەکانی قورئان چییە؟...٦
٢- (پێناسەی) قورئانی پیرۆز چییە؟......................................................٧
٣- جیاوازیی چییە لەنێوان قورئانی پیرۆزو فەرموودەی قودسیدا؟..........٧
٤- ئەو بابەتانە چین کە ئێمە کە لە زانستەکانی قورئاندا دەیخوێنین ؟........١١
٥- بەرهەمی زانستەکانی قورئان چییەو مرۆڤ چی سوودێک لە فێربوونی زانستەکانی قورئان وەردەگرێت ؟.......................................................١١
٦- ئایا زانستەکانی قورئان ناوی دیکەی هەیە ؟....................................١٣
٧- ئەم زانستانە لەچیەوە سەرچاوەیان وەرگرتووەو لە کوێوە وەرگیراون؟ .......١٣
٨- حوکمی فێربوونی ئەم زانستانە چییە ئایا فەڕزی عەینە یان فەڕزی کیفایەتە ؟..١٣
٩- جیاوازی نێوان وشەی مصحف (موسحەف) لەگەڵ قورئاندا چییە؟.........١٤
١٠- زانستەکانی قورئان چۆن دروســتبوون و بەچەند قۆنــاغدا تێپــەڕیون ئەم زانستانە چۆن گەیشتۆتە دەستی ئێمە ؟.........................................١٤
١١- ناودارترین ئەو کتێبانە چین کە لە زانستی قورئاندا زۆر ناودارن ؟........١٦
١٢- سرووش مانای چییە لە زمانو زاراوەدا ؟.......................................١٦
١٣- جۆرەکانی سرووش لە ڕووی زمانەوانییەوە چین ؟..........................١٧
١٤- سرووش لەزاراوەی شەرعییدا چەند جۆری هەیە ؟..........................١٨
١٥- حاڵەتەکانی هــاتنە خوارەوەی سرووش بۆ پێغــەمبەری خودا (ﷺ) چۆن بووە چەند حاڵەتی هەبووە ؟.......................................................٢٠
١٦- ئەو ئایەتانە چین کە سەبارەت بەوەی کە قورئانی پیرۆز هەمووی بەجارێك

دابەزیبێت بۆ ئاسمانی یەکەم دواتریش بۆلای پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟......٢١
١٧- ئەو ئایەتانە چین کە باس لە دابەزینی قورئانی پیرۆز دەکەن بەشێوەی پارچە پارچە، یاخود بەش بەش بەپێی ڕووداوەکان ؟ ............................ ٢١
١٨- بیروڕای زانایانی ئیسلام چییە سەبارەت بە دابەزینی قورئان ؟.........٢٢
١٩- حیکمەت چییە لەوەی کە قورئانی پیرۆز دابەزیوە بەیەك پارچە لە (لوح محفوظ) وە بۆ (البیت العزة ) بۆ ئاسمانی یەکەم ؟.......................٢٣
٢٠- ئەو بڕە چەند بووە کە دابەزیوە بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) ؟.......٢٤
٢١- ئەو کاتانەی کە دیاریکرابوو بۆ دابەزینی قورئانی پیرۆز، قورئان بەچەندێك دابەزیوە؟.......................................................................٢٤
٢٢- حیکمەت چییە لەوەی کە قورئانی پیرۆز بەش بەش دابەزیوە ؟..........٢٥
٢٣- یەکەمین ئایەت کە دابەزی بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) چ ئایەتێك بووە، یاخود چ سورەتێك بوو؟.......................................................٢٦
٢٤- دوا ئایەتو کۆتا ئایەت چی بوو کە دابەزیوە لە قورئانی پیرۆزدا بەشێوەیەکی گشتیی ؟ ...................................................................٢٩
٢٥- دوا سورەت چی بووە کە بە کاملّیی(تەواویی) دابەزیوە لە قورئانی پیرۆزدا ؟...........................................................................٣٠
٢٦- یەکەم ئایەت چییە کە دابەزیوە سەبارەت بە حوکمی شەڕابو مەی ؟...٣٠
٢٧- یەکەمین ئایەتو کۆتا ئایەت چی بووە سەبارەت بە ریبا (سوو)؟.......٣١
٢٨- یەکەم ئایەت چی بووە کە دابەزیوە خودای گەورە مۆڵەتی داوە بە بڕواداران کە جیهاد بکەن لەپێناو خودای گەورەدا ؟..............................٣٢

٢٩- سوودو زانستی زانینی ئەوەڵو ئاخیری(سەرەتاو كۆتایی) ئەم ئایەتانە چین كاتێك دەڵێین ئەمە سەرەتا ئایەتە دابەزیوە ئەمە كۆتا ئایەتە دابەزیوە ئایا چیمان دەست دەكەوێت ؟........................................................ ٣٢

٣٠- قورئانی پیرۆز چەند بەشی هەیە لە ڕووی هۆكاری دابەزینەوە ؟......... ٣٣

٣١- (سبب النزول) هۆكاری دابەزین واتای چییە؟............................ ٣٤

٣٢- چۆن ئاشنابین بە هۆكارەكانی دابەزینی ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز؟....... ٣٤

٣٣- شێوازەكانی باسكردنی أسباب نزول (هۆكاری دابەزین) چۆنەو بەچی شێوازێك باس دەكرێت؟ ............................................................. ٣٥

٣٤- ئێمە چۆن دەتوانین هۆكاری دابەزینەكان دیاری بكەین ؟ .............. ٣٥

٣٥- بەناو بانگترین ئەو كتێبانەی كە باسی أسباب نزول (هۆكارەكانی دابەزین) دەكات چین ؟............................................................ ٣٦

٣٦- حوكمی قسەی (هاوەڵ) چییە لە (أسباب النزول) ( هۆكاری دابەزیندا)؟.... ٣٦

٣٧- ئایا قسەی شوێنكەوتەی هاوەڵان (تابعین) وەردەگیرێت لە (هۆكاری دابەزین)، (أسباب النزول)دا ؟ ............................................ ٣٧

٣٨- سەرچاوەكانی زانینی هۆكاری دابەزین چین لەكوێی بگەڕێن بۆ هۆكاری دابەزین ؟............................................................. ٣٧

٣٩- هەڵوێستی موفەسیر (ڕاڤەكار) چییە كاتێك كە دەبینێت چەند ڕیوایەتێك (گێڕانەوەیەك) هەیە لەسەر دابەزینی یەك ئایەت ؟............................ ٣٨

٤٠- سوودی زانینی أسباب نزول (هۆكاری دابەزین) چییە ؟ .................. ٤٠

٤١- مەبەست لە سورەتی مەككییو سورەتی مەدەنیی چییە ؟............. ٤٠

٤٢- چۆن بزانین ئەم سورەتە مەككییە، یان مەدەنییە ؟........................ ٤٢

٤٣- ئەو سورەتە مەدەنییانە چین کە جێی کۆڕاو هاودەنگیی زانایانە ؟ .......٤٣

٤٤- ئەو سورەتانە چین کە جێی ڕاجیاوازیی زانایانەو لەسەری کۆدەنگ نین ؟ ..٤٣

٤٥- ئەو سورەتانەی کە جێ کۆدەنگی زانایانن کە مەککین چین ؟ .........٤٣

٤٦- ڕێساکانی زانینی سورەتی مـەککیی چییە چۆن بزانین ئەم ســورەتە مەککییە ؟ ..........................................................................٤٤

٤٧- تایبەتمەندییەکانی سورەتە مەککییەکان چین ؟...............................٤٥

٤٨- ڕێساکانی ناسینەوەی ســورەتە مەدەنییەکان چــین چۆن بزانین ئــەم سورەتە مەدەنییە ؟..............................................................٤٦

٤٩- تایبەتمەندییەکانی سورەتە مەدەنییەکان چین ؟...............................٤٧

٥٠- سوودی زانینی سورەتە مەککیی‌و مەدەنییەکان چییە ؟ .................٤٨

٥١- فەزائیلی قورئان مانای چییەو بابەتەکانی چییە ؟............................٤٩

٥٢- گرینگی زانینی فەزائیلی قورئان چییە ؟..........................................٤٩

٥٣- فەزڵی قورئانی پیرۆز چییە بەسەر کتێبە ئاسمانییەکانی تردا ؟..........٥٠

٥٤- فـەزڵو گەورەیی خوێندنەوەی قورئــان چییە کە لە قورئان و سوننەتـــدا هاتبێت ؟ ..........................................................................٥١

٥٥- پاداشتی گوێگرتن لە قورئـــان چییە ؟..........................................٥٢

٥٦- سوودو پاداشتی کۆبوونەوە بۆ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز چییە ؟........٥٢

٥٧- فەزڵی ئەو کەسە چییە کە قورئانی پیرۆز فێر دەبێت و خەڵکیش فـــێر دەکات ؟.....................................................................٥٣

٥٨- ئادابەکانی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز چین ؟ ............................... ٥٣

٥٩- دیارتــرین ئەو کتێبانە چییە کە لەبارەی فەزائیلی قورئــانی پیـــرۆزەوە نووسراوە ؟................................................................................. ٥٤

٦٠- ئەو کتێبانە چین کە باسی ئادابەکانی ئەهلی قورئانی پیرۆز دەکەن ؟..... ٥٥

٦١- سیفەتە بەرزەکانو خاسیەتە بەرزەکانی قورئانی پیرۆز چییە ؟......... ٥٥

٦٢- مەبەست چییە لەوەی کە قورئانی پیرۆز بە حەوت پیت دابەزیوە ؟....... ٥٧

٦٣- ئایا ئەم حەوت زارە لە قورئانی پیرۆزدا ماوەتەوە ؟ ......................... ٥٩

٦٤- حیکمەت چییە لەوەی کە قورئانی پیرۆز بە حەوت شێواز دابەزیوە ؟........ ٥٩

٦٥- مەبەست چییە لە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز ؟............................. ٦١

٦٦- بەڵگە چییە لەسەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز دابەزیوە بەحـــەوت پیت، یاخود بەحەوت شێوە ؟........................................................................ ٦١

٦٧- حوکمی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز چییە ؟ ...................................... ٦٣

٦٨- ئایا قورئانی پیرۆز لەبەرکردن فەزڵی هەیە ؟ .................................. ٦٣

٦٩- چی ڕێگای بۆ پێغـــەمبەری خودا (ﷺ) ئاسان کردووە کە قورئـــانی پیرۆز زوو لەبەربکات بەردەوام کە بۆی دەهات لەبەری دەکرد ؟.......... ٦٤

٧٠- بەناوبانگترین ئەو هـــاوەڵانە کێ بوون کە قورئـــانیان لەبەر بووە لە موهاجیرین (کۆچکردووان) ؟ ........................................................... ٦٥

٧١- ئەی بەناوبانگترین ئەو هاوەڵانەی کە لە ئەنسار قورئـــانیان لەبەر بوو کێ بوون ؟ .................................................................... ٦٥

٧٢- قورئانی پیرۆز چەند جار نووسراوەتەوە ؟........................................٦٦

٧٣- ئـەو (هاوەڵانە) کێ بوون کە پێغـــەمبەری خودا (ﷺ) هەڵـبژاردە بوون و نووسەری سرووش بوون؟ ...................................................٦٦

٧٤- شێوازی (کۆکردنەوەی) قورئـــانی پیرۆز چـــۆن بوو لە سەردەمـــی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ؟..................................................................٦٧

٧٥- بۆچـــی لەسەردەمی پێغـــەمبەری خـــودا (ﷺ) قورئـــانی پیـــرۆز نووسراوەتەوە ؟ ......................................................................٦٧

٧٦- ئامرازەکانی نووسینەوە چی بووە لە سەردەمی سەحابەدا (هاوەڵان) ؟ .......٦٨

٧٧- بۆچی لە ســـەردەمی پێغـــــەمبەری خودا (ﷺ) قورئـــانی پیـــرۆز کۆنەکرایەوە نەکرا بە موسحەفێك ؟.......................................................٦٨

٧٨- هۆکـاری کۆکردنەوەی قـورئـــانی پیـــرۆز چی بوو لەلایەن ئیمـــامی ئەبوبەکری سیدیقەوە (رضی الله عنه) ؟..................................................٦٩

٧٩- مێژووی کۆکردنەوەی قورئـــانی پیـرۆز لە سەردەمی ئیمامی ئەبوبەکرا (رضی الله عنه) ئەگەڕێتەوە بۆ کەی ؟.............................................٧٠

٨٠- هۆکاری هەڵبژاردنی ئیمامی ئەبوبـــەکر (رضی الله عنه) چـــی بوو بۆ «زیدی کوڕی ثابت» کە کردی بە ســـەرپەرشتیاری پـــڕۆژەی کۆکردنـــەوەی قورئانی پیرۆز ؟ ........................................................................٧٠

٨١- ئـــایـــا ڕێبـــازی «زیدی کوڕی ثـــابت «رضی اللـــه عنه چـــی بوو لە کۆکردنەوەی قورئاندا ؟ ...............................................................٧١

٨٢- خاصیەتەکانی کۆکردنەوەی قـورئـانی پیرۆز چی بوون لـــە ســـەردەمی ئیمامی ئەبوبەکری (صدیق رضی الله عنه) ؟ ....................................٧٢

٨٣- پێگەی كۆكردنەوەی قورئانی پیرۆزی ئیمامی ئەبـــوبەكری (رضی الله عنه) چی بوو لای سەحابە ؟..................................................... ٧٣

٨٤- ئەو موسحەفەی كە كۆكراوەی هەموو قـورئـانی پیـــرۆزە چی لێهـات دوای ئەوەی كە تەواو بوو ؟..................................................... ٧٣

٨٥- بۆچی ئیمامی عثمان (رضی الله عنه) هەڵسا بەكۆكردنەوەی قورئـــانی پیرۆز دووبارە ؟............................................................ ٧٦

٨٦- مێژووی كۆكردنەوەی قورئانی لە زەمەنی ئیمـامی عثمـــاندا (رضی الله عنه)كەی بوو ؟............................................................ ٧٦

٨٧- ئەندامانی ئەو لیژنەی كێ بوون كە ئیمـامی عثـمـــان (رضی الله عنه) هەڵیبژاردن بۆ ئەم كارە ؟..................................................... ٧٧

٨٨- شێوازی كۆكردنەوەی قورئـــانی پیرۆز چۆن بووە لەسەردەمی ئیمـــامی عوسماندا (رضی الله عنه) ؟ ..................................................... ٧٧

٨٩- خاسیەتەكانی كۆكردنەوەی قورئـــانی پیرۆز چۆن بووە لە ســـەردەمی ئیمامی عثمان (رضی الله عنه) ؟ .............................................. ٧٩

٩٠- هەڵوێستی هـــاوەڵانی پێغـەمبەری خــودا (ﷺ) چی بووە لەســـەر ئەم كارەی ئیمامی عثمان (رضی الله عنه) ؟........................................ ٨٠

٩١- ژمـــارەی ئەو موسحەفـــانە چەند بوون كە ئیمامی عثـمـان (رضی الله عنه) فەرمانی كرد بە نووسینەوەو ناردنی بۆ ناوچەكان ؟...................... ٨٠

٩٢- جیاوازی نێوان كۆكردنەوەی ئیمامی ابو بكرو ئیمامی عثمـــان چی بوو (رضی الله عنهما) ؟...................................................... ٨١

٩٣- پێناسەی سورەت چییە ؟ ................................................ ٨٢

٩٤- چۆن ئەو سورەتانە دەناسین ؟........................................................ ٨٣

٩٥- ژمارەی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز چەندە ؟.................................. ٨٣

٩٦- ســـورەتەکانی قورئـــانی پیرۆز ئەکرێن بەچەند بەشـــەوە لە ڕووی ناوەوە ؟................................................................................. ٨٣

٩٧- ســـورەتەکانی قورئـــانی پیـــرۆز دەکرێن بەچەند بەشـــەوە لەڕووی کورتیی‌و درێژییەوە ؟............................................................ ٨٤

٩٨- بەشەکانی (المفصل) چەندە ؟........................................................ ٨٦

٩٩- ڕای زانایان چییە لەسەر ڕێکخستنی ســـورەتەکانی قورئـــانی پیـــرۆز؟ هەڵوێســـتی ئێمە چـــی بێت ســـەبارەت بە (ڕێکخســـتن‌و ڕیزکـــردنی سورەتەکانی)ی قورئانی پیرۆز ؟............................................................ ٨٦

١٠٠- ئایەت مانای چییە لەزمان‌و لە زاراوەدا ؟...................................... ٨٨

١٠١- ژمارەی ئایەتەکانی قورئـــانی پیرۆز چـــەندە ؟............................. ٨٨

01

# 101 پرسیار لە زانستەکانی قورئانی پیرۆز

ڕێبوارانی ڕێگای قورئانی پیرۆز، شکۆدارترین ڕێبوارانی سەر زەوین، هەڵگرانی ئاڵای ئیسلام و نووری سروشی خودایین، شارەزابوون لە زانستەکانی قورئانی پیرۆزدا شارەزابوونە لە پیرۆزترین و گەورەترین زانستدا، کێ لەو کەسە گەورەترە کە نووری قورئان سورمەی چاو و ویردی زار و ڕابەری ژیانییەتی؟!

ئەم کتێبەی بەردەستت (١٠١) پرسیارە لە پڕۆژەیەکی گەورەدا بۆ خزمەتی زانستەکانی قورئانی پیرۆز کە بریتییە لە (٣٠٣) پرسیار.

بەشدارییکردن تیایدا بەشداربوونە لە خێرێکی نەبڕاوە.

**(قَدْ جَاءَكُمْ مِنَ اللَّهِ نُورٌ وَكِتَـٰبٌ مُبِينٌ)** المائدة:١٥


**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی


/TafseerOffice

+964 **750 818 08 65**
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

